لە چاپكراوەكانی كۆڕی زانیاری كورد

# وردبوونەوە لە چەند باسێكی ڕێزمانی كوردی



ئەندامی كارا

مەسعود محەمەد

چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد

بەغدا — ١٩٧٤

# وردبونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی

ئەندامی کارا

مەسعود محەمەد

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا — ١٩٧٤

# پێشەکی

زمانی کوردی لە هەمو مێژوودا خاوەنێکی دەسەڵاتدار و دڵسۆزی نەبوە . لەوەتەی مادەکان لێیان تێک چوە ، بەر لە ٢٥٠٠ ساڵ زیاتر ، میللەتی کورد خاوەن کیانی سیاسی و حکومەت نەبوە تا کو توانیبێتی خزمەتی زمانەکەی بکا و بەرەوژوورتری ببا بەهۆی سازدان و لە چەرخدانیەوە بۆ بەکارهێنانی ئەدەبی و رەسمی و هونەری یاخود هەرنەبێ رێزمان و دەستورەکانی بپارێزێ و وەک زمانێکی یەکگرتو لە سەرانسەری کوردستاندا بیهێڵێتەوە . مەل و گیای دەشت و دەر چەند لەخۆوە دەژین و زۆر و کەمدەکەن و رێکەوتی خۆش و ناخۆش بەرەوپێش و بەرەو پاشیان دێنێ و دەبا زمانی کوردیش ، لەچاو زمانەکانی تری خاوەن کیان وحکومەت ، هێندە خۆڕسک و بێ شوان و باغەوان و پەرژین و ئاو و دان بوە . لێرە بەپێشەوە نە دەس بژارێک کراوە ، نە خزمەت و خۆراکێکی دیوە نە یارمەتییێک دراوە لە کەوتن راست بێتەوە یاخود بەسەر پێیانەوە تاقەتی راوەستانی هەبێ . تازەبەتازە نەبێ بەجۆرێکی سەرەتایی و کەوتوڕەوت پشکنینەوەی تێدا دەکرێ و هەوڵی بەرەوپێش بردنی

دەدرێ ، لەکۆنەوە نەبیستراوە چ لایەنێکی دەسەلاتدار خۆی تێ گەیاندبێ مەگەر خۆتێ گەیاندنی دوشمنانە و ناحەزانە . ئەمەی لێرەدا دەیڵێم وەك بەڵگەنەویست «بدیهیە» دێتە بەر چاوان ، یەکێك بیەوێ نەیسەلمێنێ ئەرکی هێنانەوەی بەڵگە بۆ نەسەلماندن دەکەوێتە ئەستۆی خۆیەوە .

مێژوی میللەتی کورد بە هەموو تاریکی و نەزانراوی و بێ تۆژینەوەی خۆیەوە هێشتان لەزمانی کوردی بەرچاوتر و شوێنەوار رونترە : رەنگە بتوانین کورتە باسێکی بەسەرهاتی میللەتەکمان بگێڕینەوە ، پێ بەپێ لە چەند هەزار ساڵێکەوە تا رۆژانی ئێستا لەگەڵیدا سەرەوژێر بینەوە و تا رادەیێکیش لەو بەسەرهاتە بگەین و هۆی رودانی ، کەم کەمە ، بە دەستەوە بدەین ، بەلام زمانەکمان زۆر و کەم سەرگوزەشتی نیوە مەعلومیشی نیە ، کەس ناتوانێ و نازانێ بڵێ بەر لە هەزار ساڵ زمانی کوردی چۆن بوە و لەهجەکانی لە چ بارێکدا بون ، فەرهەنگی وشەکانی چەند بو ، رێزمانی ئەوسای لەچاو هی ئێستای چ جوداوازییێکی هەبو ، دواتر چی بەسەرهات و لە کام رێبازەوە بەرەو شکڵی ئێستاکەی گلێر بۆوە ... پێشتر چۆن بو ، کەوتبوە بەر تاوی کام سەقافەت ، چەند لەهجە بو ، لەهجەکانی لە چیەوە پەیدابون و چۆن لەیەکتر دور دەکەوتنەوە ، بۆچی دور دەکەوتنەوە . پوختەی گوتە ئەوەیە تا ئێستا ئەوەی لە باری مێژوی زمانی کوردی و لەهجەکان و فەرهەنگ و ئەدەب و فۆلکلۆریەوە دەزانین هەر ئەوەیە کە لە هەڵکەوتی ئێستاکە و رابردوێکی زۆر نوێ بۆمان دەردەکەوێ ،

هەرچی هۆی بەستنەوەی رابردوی کۆنی بە ئێستاکەیەوە هەیە لێمان بزرە . پاشماوەی زەردەشت و ئاڤێستا ، بە نیسبەت زانستی ئێستامانەوە ، بەتەواوی پچڕاوەتەوە لە رۆژگاری دوا خۆیانەوە . کەمتاکورتێك لە زانیاری مامۆستاکانی ئەم چەرخە دەربارەی ئاڤێستا و نزیکی و دوری لە کوردی ئەم رۆژانەمان بایی ئەوە ناکا چ هەنگاوێکی گرنگی بۆ باوێین بەرەو دۆزینەوەی پەیوەندی میانی زمانی کوردی ئەوسا و ئێستا و جۆر و هۆی گۆڕانی لە شکلی کۆنیەوە بۆ هی چەرخەکانی نوێی .

پڕ کردنەوەی بەتالایی و کەلەبەر لە زانستەکانی « کورد ناسی »دا بەندە بە چالاکی پسپۆڕانەی ئارکیۆلۆجییەوە : بەلای باوەڕی منەوە ئیمکان نیە نەخشەیێکی مەفهوم و قەناعەتهێنی مێژوی بەسەرهاتی کورد و زمانی کوردی بکێشرێ بەر لەوە زاناکانی ئاسار لە ژێر خاکی کوردستانەوە مەعلومات بەسەر بخەن . دەبێ سینەی گۆڕستانی مێژوی کورد کە خاکی کوردستانە لە چەندین جێگە ماسی دڕی ای بدرێ و چێن چێن رابردوی بە سەر یەکتردا تەپیوی وەك پەڕەی کتێبێ شڕ هەڵدرێنەوە و واتاکانیان لێك بدرێنەوە . زانایانی ئاسار کاری یەکجار گرانتریان کردوە لە دەرهێنانەوەی مێژوی کورد کە میللەتێکی زیندووە و بە خۆی و مەفتەنیەوە درێژەی ئەو رابردووە ژێر خاك بووەیە : مێژو و زمانی گەلێك میللەتی لە ناو چوی خرانەوە سەر رو پەڕەی زیندەگانییەوە و بونەوە زانیاری سەرەتایی کە لەفێرگەکان بە دەرس دەخوێندرێن ، وا هەیە رێزمانیشیان دۆزراوەتەوە و کتێبی لە سەر دانراوە . هەڵکەندنی گردی « شمشارە » لە خواروی رانیە

بە سەر زێی بچوکەوە رۆناکاییەکی گرنگی خستە سەر باری ئەو ناوچەیە و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ولاتی دراوسێ و دوور و نزیکیەوە لە رۆژگارێکدا کە هەزار ساڵ زیاتر پێش زەردەشتەوە دێت . لەم هەڵکەندنە و دۆزینەوە و خوێندنەوەی خشتە سوورکراوە لێ نوسراوەکانیەوە ، بۆ یەکەم جار لەهەموو مێژوودا ، زانرا ناوەکانی ئاوایی و گردە دەس کردەکانی ئەو ناوچەیە لە نزیکەی چوار هەزار ساڵەوە گۆڕانێکی کەم نەبێ بە سەریاندا نەهاتوە . ناوی «شمشارە» خۆی ئەوسا «شوشەرا» بوە ، چەندین دێ و وێرانکەی تریش لە ناوچەی بیتوێن و رانیەدا هەر ئەو ناوانەیان هەبوە کە ئێستا هەیانە وەك دێی «کامەریان» کە ئەوسا «شیمەرینی»[1] بوە .. ئەم دۆزینەوانە سرنج بۆ هێندێ دەبەن کەوا هەر لە یەکتر چوونێك لەمیانی ناوێکی کۆن و یەکێکی نوێ لە ئاواییەکانی کوردستان بێتە بەر چاو ، هەڵدەگرێ ببێتە بەڵگە و یەکبوونی ئەم دوو شوێنە بسەلمێنێ .

جگە لە ناوەکان ، کەوا کەرستەیێکی زۆر گرنگی زانستی و مێژوویی بەرهەم دێنن بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی رابردووی کۆن و نوێی کورد ، لەو نوسینانەی سەر خشتەکان فەرهەنگۆکێکی وشەی عادەتیش پێك دێت لێی دەوەشێتەوە بەراورد بکرێت لەگەڵ فەرهەنگی ئێستای زمانی کوردی : نوسینەکان بە زمانی «خوری»

(١) بڕوانە : گۆڤاری «سۆمەر» ، بەرگی ١٦ ، ساڵی ١٩٦٠ ، ل ١٥ .

نوسراون و لە لایەن پسپۆرێکی زمانەکەوە لە خەتی « میخی »یەوە بۆ خەتی لاتینی گۆڕاون و بە زمانی ئینگلیزیش تەرجەمە کراون . هەرچەند نوسینەکان توێژینەوەیێکی زۆریان دەوێ و جارێ بە جۆرێکی سەرەتایی بڵاو بونەتەوە و تەرجەمە کراون ، لەگەڵ ئەمەشدا لە بەرچاوی من دروشم و رەنگ و شێوەی زمانی کوردیان تێدا دەدۆزرێتەوە . ئەگەر چاوم رەشکەوپێشکەی نەکردبێ لە دیتنی شێوە و تارمایی زمانی کوردی لەو نوسینانەی گردی « شمشارە » و بە تەواوی ساغ بێتەوە کە وا زمانی کوردی ئێستا و زمانی « خوری » کۆن لەیەك دەکەن هەنگاوێکی زۆر فرەوان بەرەوپێشەوە دەچین لە سەپاندنی ئەو کۆنە باوەڕەم کە وا میللەتی کورد و «خوری» هەر یەکن وە یاخود هەر نەبێ خوریەکان رەگەزێکی زلن لەو شادەمارانەی رایەڵەی « کوردایەتی » پێك دێنن . لێرەدا نمونەیێك دێنمەوە لەو رستە خوریانە کە وا بەسەر خشتە سورکراوەکانی شمشارەوە نوسراونەوە .

لە ژمارە (١٣)ەی گۆڤاری «سۆمەر»ی ساڵی ١٩٥٧ لە گوتاری پرۆفیسۆر ج. لێسۆ ئەم رستەیە بە نوسینی لاتینی دەخوێنیتەوە کە رستەکە خۆی بە زمانی خورییە « tuppaka sa tusabilam » . واتای رستەکەش بە زمانی ئینگلیزی بەم جۆرەیە کە لە هەمان جێگە لە گوتارەکەدا تۆمار کراوە « your letter which you sent me » . واتای رستەکە بە کوردی ئەمە دەردەچێ « نامەکەت کە بۆت ناردبوم » . کە ورد بیتەوە دەبینی لە ( نوسینەکەی خوری )دا دوو جاران وشەی «tu» دێتەوە کە وا بە زاهیر « تو »ی کوردی

ئێستاکەیە . لە کۆتایی رستەکەشدا پیتی «m» هەیە کە ئەویش راناوی کەسی یەکەمی تاکە لە کوردیی ئێستاکەدا . وشەی «sabila» بە لای باوەڕی منەوە ئەویش « سپارد ، راسپارد »ی ئێستاکەی کوردیی خۆمانە . وەنیە من چ دیراسەیێکی زمانی خۆریم کردبێ ، چی لێرەدا دەیڵێم خوێندنەوەیێکی سەرپێ و رواڵەتی ئەو رستانەیە کە لە گوتارەکەدا نوسراون .

جا ئەگەر ئەم یەك بۆنەی کورد و خۆری بە تەواوی ساغ بۆوە و سەلماندمان زمانی ئێستای کورد ئەوەی زمانی ئەوسای خۆرییەکانە راستەوخۆ هەزار ساڵێك لە ئاڤێستا زۆرتر دەگەرینەوە بەرەو دۆزینەوەی کۆنترین سەرچاوەی نوسراوی کوردیی .

بە هەمە حاڵ هەڵکەندنەکانی « شمشارە » زەخیرەیێکی زلی مێژوویتی بەدەستەوە دا و رووناکییێکی بە هێزی خستە سەر گەلێك باری نەزانراوی ناوچەی رانیە و بیتوێن و ئەو شوێنانەی پەیوەندییان پێیەوە هەبوە لە دوور و نیزیکەوە . دەوجا کە هەڵکەندنی تاکە یەك گرد ئەو هەمو ئەنجامە بە دەستەوە بدا تۆ بڵێی رووپێو[2] کردنێکی سەر لەبەری کوردستان بە پشکنینەوەی ئارکایۆلۆجیی دەبێ چمان بۆ پەیدا بکا ؟ ، بێ گومان بەرهەمێکی لە ئەندازە بەدەر .

لێرەدا دەمەوێ لە خوێنەری کورد بگەیەنم ، بە پێی باوەڕی خۆم ، دۆزینەوەی بنچەکانی زمان و رێزمانی کوردیی بەندە بە

---

(۲) رووپێو کردن : مسح ، مساحة .

تۆژینەوەی ئارکایۆلۆجی لە سەرانسەری ، یاخود بەشی زۆری ، کوردستاندا . ئەم تۆژینەوەش تا ئێستا نە هیچی ئەوتۆی کراوە ببێتە بناخەی دیراسەیێکی فیلۆلۆجی کە خۆ پێوە ماندوَ کردن بهێنێ ، نە چ موژدەیێکیش لە ئاسۆی کوردستانەوە هەواڵی تۆژینەوەیێکی ئارکایۆلۆجی نێزیکمان بۆ دێنێ . خۆ ئەوەی راستی بێ ئەگەر لەم لەحزەیەدا پێمان بڵێن بڕیار دەرچو لە لایەن میللەتە یەکگرتووەکانەوە کە زانایانی ئارکایۆلۆجی و کوردناسی خەریکی هەڵکەندن و ماسی دژ لێدان بن لە هەمو بستێکی خاکی کوردستاندا کە گومانی تێدا بچێ ئەنتیکی لێ دەکرێ ، دەبێ ساڵەهای ساڵ بە دیار بەرهەمی ئەو هەوڵ و تەقەللایە زانستییانەوە راوەستین تا دەردەست دەکرێن و دەزانرێن و پوختە دەبن و دێنە قاڵبی سود لێ وەرگرتنەوە . ئەم کارە خەیاڵییە کە چەندین ساڵی پێ دەوێ ، کاری حەقیقی دەیان و زیاتر لە دەیان ساڵی پێ دەوێ . رەنگە خەیاڵەکەش هەر نەیێتە دی ..

ئەمە راستیێکە دەمەتەقە هەڵ ناگرێ . کەواتە چاوەنۆڕ کردنی روَن بونەوەی مێژوَی میللەتی کورد و زمانی کوردی بە نیازی خۆ هەڵگرتن بۆ ئەوە ئەوساکە دەست بکرێ بە دۆزینەوەی دەستورەکانی زمانەکەمان ، سەرەڕای ئەوە کە کارێکی دوَ بەختییە ( یا دەبێ یا نابێ ) پەك خستنی هەمو توانایێکیشە لە مەیدانی زمانزانیدا بە دیار ئومێدێکی مەوهومەوە بۆ ماوەیێکی کۆتایی بزر . تا ئێستا هیچ میللەتێك لە هیچ مەیدانێکی زانستدا ، زمان بێ یا شتێکی تر ، دەست و قەڵەمی خۆی رەق نەکردوە بە هۆی ناتەواوی مەعلومات تێیدا : فەلەکناسەکان ئەگەر پەیڕەوی ئەم

تێفکرینەیان کردبا و راوەستابان تا رۆژگاری ئاسمـان گەردتی ، دەبوا ورتەیان لەبەرەوە نەبێ نەك هەر لە سەردەمی سۆمەر و بابل و میسری کۆن و یۆنانەکانەوە بگرە تا گالیلیۆ و کۆپەرنیکۆسیش .. بەم گەز و گرێیە رەنگە ئیمڕۆش فەلەکناسان مافی قسە کردنیان نەبێ لە بارەی ئاسمانەوە بە هۆی ئەوەوە کە هێشتا زانستی فەلەك لە چاو پانایی و قوولایی بێ بـڕانەوەی جیهاندا وەك قەترە بە دەریایە . دەبێ فینیقیەکانیش دەریا گەڕتی نەکەن چونکە هێشتا چی ئەوتۆ لە بارەی دەریاکانی هـەمو جیهانەوە نەزانرابێ لەوە گەڕێ زانستەکە تۆماریش نەکرابێ . کە قیـاس لە زمان و ئاسمانـگەردتی و دەریاپێوی بکەیت هەمو زانستەکانی تریش دەبێ خەویان لێ بکەوێ تا کاتێـکی کەس نەزانیو .

لەوەڕا مەعلوم دەکرێ ئەو دەنگ و سەدایەی کە ناوناوە دێتە بەر گوێمان و موژدەیێـکی غەیبی بە کورد دەدا و پیرۆزباییشی لێ دەکا بە بۆنەی رۆن کردنەوەی مێژوی زمانەکەمان هەر لە زەردەشتەوە تا ئیمڕۆ لاریێ هەول و تەقەڵلای زانســـت کارانەی خۆیەوە ، چ بنج و بناوانێـکی ئەوتۆی نیە دڵ خۆش کا .. دەنـگ و سەدایەکە هەر بە موژدە دانیش رازی نابێ ، لە ژێر لێوەوە تێشمان دەگەیەنێ کەوا خەریك بێ شـارەزایانی زمان بە دانانی دەستوری رێزمان بۆ ئاخاوتنی کوردتی ئەم سەردەمە کارێـکی کاڵ و کرچە و زەحمـەتی بێهودەیە . کە ئەمە دەڵێم خۆشم دەزانم دۆزینەوەی داوی پەیوەندتی میانی کوردتی کۆن و لەهجەکانی ئێـستاکەی کارێـکە لێی دەوەشێتەوە پەیکەری زێڕی بۆ دارژرێ و خاوەنەکەی بە پێشەوای سەرلەبەری

رۆشنبیر و نوســـەر و زانایانی کورد لە قەڵەم بدرێت و وەك (احمد شوقي) بکرێ بە میری کوردناسیی ، تاج و گۆچانی ئیمارەتی پێ بدرێت . بەڵام حەز کردن و خۆش ئامەدیی کردنی من لە شتێك نابێتە پێك‌هێنەری ئەو شتە .. کوێر حەز لە دوو چاوی ساغ دەکا و نیوە چاوێـکی ناسـاغیشی پێ نابڕێ .. هەر وەك دەزانم کەس نیە بتوانێ قورسایی (١٠) تەن هەڵـگرێ ، وە یا بە دەست لێك دان رەهەوا کەوێ و بفڕێ ، وە یا بە بازێك لە دەجلە بپەڕێتەوە هـــەر وەهاش دەزانم ، تۆش دەزانیت ، بە کەس ناکرێ لەهەجەکانی ئێستاکەی کوردیی بە ڕێی شەقامەڕێدا بپەڕێنەوە بـۆ ســەردەمی زەردەشت و پێشتر : ئەم هەموو زانستەی فیلۆلۆجیی و کوردناسیی و ئارکاۆلۆجیی و مێژووی رۆژهەڵاتی نێزیك و ساغ کردنەوەی تاو و تەئسیری تێکەڵ بوون و تێك هەڵقوان و تێك چڕمســـانی میللەتان و زمانەکانی ئەم ناوچەیە پان و بەرینە لە ماوەی دوو سێ هەزار ســاڵاندا کاری تاکە کەس نیە ، کاری جیلێـکی ســـەرلەبەریش نیە : نەفەسی ئەم کارە لە عومری تاکە کەس و تاکە جیل یەکجار درێژترە سەیری ئاشووریناسیی بکە کە وا لە ١٠٠ ساڵ زیاترە زاناکانی ئاسار تێیدا خەریکن و جیلا و جیل زانستەکانیان بۆ یەکتر دەور و تەســلیم دەکەن و هێشتانیش بە رێگاوەن .

بڕیاری دوازۆز چیدەبێ با ببێ لە بارەی روون کـردنەوەی مێژووی کورد و زمانی کوردییەوە ، گریمان دەستێکی قودرەت ئـەم مێژووەی بۆ خستینە بەر تیشکی نێوەڕۆ و هەندی کتێبێکی چـاپ

گراوی خەت خۆشی بێ هەڵە ئاسان بێ بۆ خـــوێندنەوە و بـۆ تێگەیشتنیشی ، ئا لەم حاڵەشدا کە لە حاڵی بەهەشت دەکا نـەك هی زەوێ ، خەریك بـــوون بە ڕێزمانی ئاخاوتنی ئێستاکەمانەوە هــەر بە ملەوەیە و دەبێ بکرێ و بنوسرێ و بڵاوبێتەوە و بخوێنرێتەوە.

بۆیەیە تۆژینەوەی فیلۆلۆجێ و ڕێزمانێ لەم ڕۆژگارەدا بـــە هەمە حاڵ پێویستی سەر شانی زمانەوانانە ، هەر یەکەیان بە قەدەر توانایی خۆی . ئامادە کردنی دیراسەی (خـــورد یاخود درشت)ی زمانی کوردێ لە هەردوو حاڵـــی ڕوون بوونەوە و ڕوون نەبوونەوەی مێژووی زمانەکەمان کارێـکی سوود بەخشە ، لە سوود بەخشیش پترە چونـکە پێویـستە : ئەگەر مێژوو ڕوون نەکرایەوە ناچارین دەبێ دەستە و داوەنی ئاخاوتنی ئێستاکەمان بین و لێی بکۆڵینەوە . کە مێژووش ڕوونکرایەوە ئەوساش ماوەیێکی باش بڕدراوە لە ئامادەکردنی دیراســەی پوختەی باری ئێستای زمانی کوردێ . لە فەرزی جەمســەری هەنـــدێك لەو دەستورانەی کەئیمڕۆ دەدۆزرێنـــەوە لەگەڵ جەمســـەری دەستورە مێژوویییەکان یەکتر نەگرنەوە و نەگونجێن ، دیسانەوە تەعدیل کردنی دەستورەکانی نوێ بۆ گونجاندنیان لەگەڵ هی کۆن ئاسانـتر دەبێ لەوە کە لە سەرەتاوە دەست بکرێ بە دانـان و دۆزینەوەیان ، ڕەنگە بەشێکی زۆریش لەو دەستورە نوێیانە بێ تەعدیل کردن ببنە درێژە پێدانێـکی ئاسایی و ڕاستەوخۆی دەستوراتی کۆنینە .

وا دەزانم حورمەت گرتنی ئەم ئیحتیماڵە زۆر بێهێزەی دۆزینەوەی سەرەتاکانی زمانی کوردێ لە پێش سێ چـوار هەزار ساڵێـکەوە ،

هەر ئەوەندەی لێ دەوەشێتەوە کە تازە خستمە ڕوَ ؛ هەرگیز داوامان لێ ناکا دەست پاچە بە دیار بوَن و نەبوَنیەوە بوەستین تا ڕۆژگارێکی بێ بڕانەوە یاخود زۆر دوَر و درێژ . وەستاندان زیانێکی سادە و بێ تەئویلە لە خۆمان و لە زمانەکەشمانی دە دەین .

ئەم باوەڕەم دەمهاوێتە سەر ڕێبازی خۆش ئامەدەی کردن لە هەموَ چالاکیێکی زمانزانانی کورد بەرەو دۆزینەوەی دەستوَرە ورد و درشتەکانی زمانی کوردیَ ، فەتوا بۆ خۆشم دەدا کە وا لە گوێرەی دەسەلاَتی خۆم ، بە تەنهایی یاخود لەگەلَ خەلقی تر ، لەو تەرزە چالاکیەدا دەستێکم هەبێ . نەزانراوی و شراوەیی دەستوَرەکانی کوردیَ بە بەریەوە هەیە خەلقێکی زۆر بۆ ماوەیێکی درێژ لەگەلی خەریك بن و لێیی نەبنەوە .

ڕەنگە بگوترێ کردنەوەی دەرگەی توَژینەوەی زمان لە ڕوَی هەموَ کەسێك قەلەبالغیێکی بێتام بە دەوری زمانەوە کۆ دەکاتەوە ، بەلاَم وادەزانم ئەم تێبینییە هەر لەسەر کاغەز بایەخدارە ، لە واقیعدا جێی مەترسی لێ کردن نیە : جارێ لە پێشەوە دەبێ بلێین و بزانین من و توَ ناتوانین ، ڕێشمان نیە ، خەلق مەنع کەین لەو چالاکیە هەروەك ناتوانین مەنعیان کەین لە ڕاوەماسی یاخود لە سێباز و شەترەنج . لەوەش بەولاوە هەرکەسە ئۆبالی بە ئەستۆی خۆی ، کە بێ و خۆ بە زمانەوە یا بە شەترەنجەوە خەریك کا : خەریك بوَنی خەلق بە زمان و غەیری زمانەوە ج ئەرکێکی مادی ناخاتە سەر شانی کەس ، بە هەلە

چۆنیشیان زەرەر لە خۆیان نەبێ نادا چونکە مەرج نیە هەڵەی فڵان و فیسار بەلای نوسەرانەوە پەسەند بێ و بکرێتە ڕێباز و شێوازی نوسین : نوسەران بە زەحمەت شتی ڕاست لەغەیری خۆیان دەسەلمێنن چ جابی هی چەوت . ئەوەی ڕاستیش بێ نوسین کارێکی ئاسان نیە ، ئەگەر بۆ خۆی ئاسانیش بێ بڵاو کردنەوەی ئاسان نیە . تۆ کە شتێکت نوسی و لێی بویەوە جارێ دوچاری گرفتی گەورە نەهاتویی : چاپ کردنی نوسراوەکەت گرفتی ڕاستەقینەیە . لەگەڵ ئەم هەمو زەحمەتەی مادی و زیهنی نوسین ، کەم وایە یەکێك خاوەن بەهرە نەبێ خۆی لێ بدا . کەواتە ئازادبونی نوسەران لە خەریك بونیان بە زمانەوە هیچ سڵ لێ کردن نیە .

خۆ خەریك کردن بە زمان و دۆزینەوەی دەستورەکانی هەر لە تاکە ڕێگەیێکەوە تێ ناکا : چەندین لایەن و کەلێن و پەنا و پەسێو هەن لە تێکڕای باسی زمان و زانستەکانی ، هەر یەکەیان لەوانەیە عومری مرۆڤ بەسەر ببەن و کۆتاییان نەبێ . بێ گومان یەخەگیر بونی سەرلەبەری ئەو سەرە باسانە بە نیسبەت تاکە کەسێکەوە کارێکە سەری هەیە بەڵام کۆتایی نیە ، چونکە بە تەنها لێیان نابێتەوە گریمان دەسەڵات و هێزی نوسینیشی هەبێ لەو هەمو مەیدانانەدا . دۆزینەوە و دانانی دەستور بۆ سەرتاسەری زمان نە ئیشی تاکە کەسە و نە لە ساڵێك و دو ساڵیشدا بە ئەنجام دەگا . خۆ ئەگەر ئەو هەمو زانستانەی زمان تۆمار بکرێن و بە درێژییەوە بخرێنە پەراوێزی کتێبێکەوە ڕەنگە کتێبەکە هێندە قورس بێ هەڵگرتنی وە زەحمەت بکەوێ .

کۆڕی زانیاری کورد ئەو هەمو لایەنانەی گرتۆتە بەرچاو و لە گوێرەی پێداویستیان پلانی کار کردن و توژینەوەی بۆ ئەندامان و لیژنەکانی داناوە . پەراوێزی ئەو پلانەی کۆڕ هێندە فراوانە دەتوانێ هەمو جۆرە زانستێکی زمان بگرێتە ناوەوە هەر لە ئێستاوە هەتا ئەو کاتانەی کۆڕ هەیە و مەعلوماتی سەر بەزمان ، لەکۆن و لە نوێ ، خۆ بە دەستەوە دەدا . بە شێوەیێکی دائیمی دوَ لیژنەی زمانی لە کار دان و لە وەتەی کۆڕ بنیاد نراوە لیژنەکانی خەریکن و هەر بەرێوەن ، چ مەعلومیش نیە کەی لەو فەرمانە دەبنەوە . لە فەرزی گەیشتنە کۆتایی کاری ئێستاکەیان دەشێ لە دوا رۆژێکی نێزیکدا سەر لە نوێ بکەونەوە کەڕ .

من بۆ خۆم لە گەڵ یەکێك لەو لیژنانە بەپێێ بەرنامەیێکی لێ هاتو بۆ توژینەوەیێکی پوختە لە شەقامەکانی ڕیزمانی کوردیَ لە دوَ ساڵ زیاترە خەریکم . لیژەکە مەودایێکی باشی بڕیوە و گەلێك راستی و تایبەتی نهێنی زمانی کوردیشی دۆزیوەتەوە لەوانەی تا ئێستا وەك شرایەوە وا بوَن . لەو لێکۆڵینەوانەدا هەوڵ دراوە سەیری ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردیَ بکرێ هەر لەبەر تیشکی سروشتی زمانی کوردیَ خۆی نەك هیَ زمانانی تر ، واتە وێستراوە ڕێزمانی کوردیَ ئازاد بێ لە تاو و گوڕی دەستوری ئەو زمانانە کە بە هۆی خەریك بوَنی زمانزانانی کورد پێیانەوە شالاویان هێناوە بۆ ناو زوربەی ئەو کتێبانە کە لەسەر ڕێزمانی کوردیَ دانراون .

ئەم لیژنەیە لەگەڵ تێکرای ڕێزمان خەریکە ، بەرهەمی

لێکۆڵینەوەکانیشی لە ئەنجامدا کتێبێکی گەورە پێك دێنێ ، لەو
کتێبانەی مەبەستیش ڕوون دەکەنەوە و خوێنەریش وەڕز ناکەن بە
درێژە پێدانی لە عادەت بەدەر . نوسینی ئەم بەڕ ئەو بەڕ لە سەر
هەمو باس و لا باسەکانی ڕێزمانی کوردی کارێکی ئەکادیمی نەفەس
درێژی ئەوتۆیە نە لەگەڵ جۆری خەریك بونی لیژنە ڕێك دەکەوێ
نەدەستیش دەدا بۆ خوێندەوارێکی ئاسایی کە هەر هێندەی مەبەستە
لە سەر جوملەی دەستوری زمان شارەزا بێ ، بە شێوەیێکی مام
ناوەنجی ، و لە ئەنجامدا بەقەدەر شاگردێکی زانکۆ ( جامعة ) تێیدا
بەڵەد بێ . ئەم تەرزە دیراسەیە کە دەست بدا بۆ خوێنەری ئاسایی ،
نەك هەر لە کوردی بەڵکو لە هەمو زمانێکدا بەدی دەکرێ و
پێداویستێکی خوێندەنەوەی ڕۆژانەی ڕۆشنبیرانە .

تۆژینەوەی ورد و درێژەبۆدراو لە پەنا و پەسێو و گۆشە
پەنهانەکانی زمان کە لە خۆیانەوە ناکەونە بەر چاو و سرنجی خوێنەری
بە پەلە و سەری ڕێ بە هۆشی مروڤێك ناگرن خۆی بۆ باسی
زمان ئامادە وە یا تەرخان نەکردبێ ، ئا ئەم تۆژینەوەیە لە پەراوێزی
دیراسەی تێکڕایی و سەرلەبەر و یەك نەفەس جێی نابێتەوە . سەیرێکی
بەشی یەکەمی ئەم نوسینە بکەی کە خەریکی ڕۆڵی تاکە یەك « پیت
وە یا دەنگ »ی زمانی کوردییە و لەگەڵ درێژەی کە هەیەتی
نەیتوانیوە هەمو سەر و بەرێکی باسەکە ناوکێڵ بکا ، بۆت ئاشکرا
دەبێ پێوانی هەمو زمانی کوردی بەم گەز و گرێیە و ڕوو چۆن
تێیدا بۆ ئەم قوڵایی‌یە هەوڵێکی بێ بڕانەوەی دەوێ ، بەرهەمەکەش

دەگـا بە بارستی « ئینسایکلۆپیدیا » . لە زمانی کـوردیدا چـەندین کەلێن و قوژبنی نە دیتراوی وا هەیە هیچ کامێکیان ناکونە ژێر سـەرەباسە بەربنەکانی رێزمانەوە و لەوانەن کتێبی فێرگـەکان هـەر خۆیانیان تێ نەگـەیەنن ، کـەچی ئـــەم وردە جەمسەر و جمگە و باریکە دەمارانە قەلافەتی زمان دەکـەن بە ســـاختێکی یەکگرتوی تەواو . وا دەبێ مەکینەیێکی زۆر گـەورە بە لێدەرکێشانی یەك دوَ برغو و بزمار هەموی لەبەریەك هەڵدەوەشێ و لە مەکینەیی دەشۆرێ . زمانیش هەر وایە : وردیلە ئەمرازەکانی لەگەڵ قوچاندن و کردنەوەی هەندێ لە پیتەکانی وە یا گوشین و شل کردنی چەند وشەیێکی ، گیان دەخەنە بەر رستە وگوتە و ئاخاوتنی و دەیانکەن بە هەڵـگری واتا و مەبەستی دەروَن و مێشکی ئەو کەســە زمانەکە بەکار دێنێ . وەك دەزانین دۆزینەوە و ئاشـــکرا کردنی ئەم وردە تایبەتییانە و پێکدا دوَران و تێکچرمسانی ناوەکی ئاخاوتن سـروشتی راسـتەقینەی زمان دەردەخەن : دەســتورە بەرچاو و بەربنەکانی زمان مرۆڤ ناگـەیەنن بـە ناوەرۆکی ، چونکە بـە هۆی زێدە بەرچاوییەوە پێویستیان نیە بە سرنج دان و لێ قوڵ بونەوە . کار و بەرکار و کارا و نـاو و ئاوەڵ ناو و ئاوەڵ کار وئەمراز ... ئەمانە سەرەباسی یەکجار بەربنن ، هێندەش بە سەر زارانەوەن هەر دەڵێی گوتنەوەیان بووە بە « تحصیل حاصل » . وا هەیە ئەم سەرە باسە بەربنانە لەبەر زۆر گوتنەوەیان لە کاتێکی کـۆنەوە ، شارەزایەکی هێندە بەر فرەوانیان لە رێزماندا تەخت کردوە ، بەربەستی هەوڵ و تەقەلای تازە دەکا لە لایەن نوسەری خاوەن رای ســـەربەخۆوە کە ئەمەش بۆ خۆی

گـرفتێکە و دەبێ چارەسـەر بکرێ چونـکە لەوانەیە گەلێك لەو دەستوور و شاڕێیە پەرەسەندوَ و باوەڕپێکراوانە هەڵەی گەورەیان تێدا بێ هەر نەبێ لەبەر ئەوە کە بە زۆریی لە دەستوور و ڕێزمانی بێگانەوە وەرگیراون و لێ بێدەنگ بوونیان دەبێتە هۆی سەپاندنی هەڵە بەسەر ڕێزمانی کوردییەوە .

لەم تێبینییانەدا مەبەسـتم ئەوەیە بڵێم و پێتی بسەلمێنم کە وا خـــەریك بوونی من و غەیری منیش بە باسـی درێژە پێ دراو لە تاکەکانی مەوزوعی ڕێزمان ئەرکـێکی پێویست و ناچارییە هەر دەبێ ئەنجام بدرێ . گریمان سـەرڕشتەی زمانی کوردیی هەڵ گرایەوە ، وەك کەلافەی دەزوَ ، تا ئاڤێستا و پێش ئاڤێستاش وە یاخود هەر تا دەورانی ساسانی وە یا بەم لاوەتر بە دوا دەستاندا هات ، ئەم کارەی شی کردنەوەی زمان و خورد کرنەوەی باسە گـەورەکانی نە پشت گوێ دەخرێ ، نە بایەخی کەم دەبێتەوە نە ئەنجام دانیشی چ زیانێك بە هەوڵ و تەقەللای کـەس دەگەیەنێ . ورد بوونەوە لە ناوەرۆکی زمانەکـەمان تا ئەو ڕادەیە کە گەڕ و سوڕی میکانیزمی دەروونی زمانەکە دیار دەخا فەرمانی سەرشانی زمانزانانی کوردە . لە گەلێك هەڵوەستی نازکدا هەست دەکرێ بە زێدە پێویست بوونی بەکار هێنانی ئەو پەڕی پسپۆڕیی و شارەزایی لە هەرچی پێی دەگوترێ « فقه اللغة ـ فیلۆلۆجی » ، ئەوســـاش ڕەنگە قەناعەت پەیدا کردنی بـێ کەلەبەر کارێکی ســـەخت بێ .

دەڵێن خڵتەی ژێر دەریا مێژوَی ملیۆنەها ســاڵی ڕوَداوەکانی

گرفتێکە و دەبێ چارەسەر بکرێ چونکە لەوانەیە گەلێك لەو دەستوور و شاژێیە پەرەسەندوو و باوەڕپێکراوانە هەڵەی گەورەیان تێدا بێ هەر نەبێ لەبەر ئەوە کە بە زۆری لە دەستوور و ڕێزمانی بێگانەوە وەرگیراون و لێ بێدەنگ بوونیان دەبێتە هۆی سەپاندنی هەڵە بەسەر ڕێزمانی کوردییەوە .

لەم تێبینییانەدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم و بێتی بسەلمێنم کە وا خەریك بوونی من و غەیری منیش بە باسی درێژە پێ دراو لە تاکەکانی مەوزوعی ڕێزمان ئەرکێکی پێویست و ناچارییە هەر دەبێ ئەنجام بدرێ . گریمان سەرڕشتەی زمانی کوردیی هەڵ کرایەوە ، وەك کەلافەی دەزوو ، تا ئاڤێستا و پێش ئاڤێستاش وە یاخود هەر تا دەورانی ساسانی وە یا بەم لاوەتر بە دوا دەستاندا هات ، ئەم کارەی شی کردنەوەی زمان و خورد کرنەوەی باسە گەورەکانی نە پشت گوێ دەخرێ ، نە بایەخی کەم دەبێتەوە نە ئەنجام دانیشی چ زیانێك بە هەوڵ و تەقەللای کەس دەگەیەنێ . ورد بوونەوە لە ناوەڕۆکی زمانەکەمان تا ئەو رادەیە کە گەڕ و سووڕی میکانیزمی دەروونی زمانەکە دیار دەخا فەرمانی سەرشانی زمانزانانی کوردە . لە گەلێك هەڵوەستی نازکدا هەست دەکرێ بە زێدە پێویست بوونی بەکار هێنانی ئەو پەڕی پسپۆڕتی و شارەزایی لە هەرچی پێی دەگوترێ « فقه اللغة ـ فیلۆلۆجی » ، ئەوسەاش ڕەنگە قەناعەت پەیدا کردنی بۆ کەلەبەر کارێکی سەخت بێ .

دەڵێن خڵتەی ژێر دەریا مێژووی ملیۆنەها ساڵی ڕوداوەکانی

فیزیایی و سروشتی سەر زەویت بۆ دەگێڕنەوە ؛ ئەمەش گوتەیێکی راستە
چونکە هەر زەڕڕەیێك لەو خلتەیە کە لە دەرەوەی دەریاکەوە سەرەوژێر
بۆتەوە بۆ تەختی بنی ، بە خۆی و حیکایەتی ئەو رووداوەی کە سەرەوژێری
کردۆتەوە چوە بۆ بنی دەریا . حیکایەتەکەی لە دەرەوە بەجێ نەهێشتوە .
وردە تایبەتییەکانی زمانیش وەك زەڕڕەی ئەو خلتەیە وایە ، ئەویش
لە بنەڕەتا زادەی رۆژگارێکی دێرین و واقیعێکی تێپەڕیوە بە هەمتو
کەین و بەین و سەر و بەرێکیەوە ، کە بە لێژگەی مێژوشدا سەرەو
خوار بۆوە تا رۆژانی ئێستاکە رەنگ و دەنگێکی زۆری ئەو رابردوەی
لەگەڵ خۆی هێناوە بە دیاری بۆمان . ئەگەر شارەزای زمان
چاوێکی زەڕڕەبین و هەستێکی مۆقلاشی هەبێ لە وانەیە گەلێك
لە رەنگ و دەنگی ئەو دیارییە کۆنە تەرجەمە بکا بۆ سەر ئاخافتن و
راوێژی ئێستاکەمان . زمانزانێکی ئاسایی کە چاو و هەستی زەڕڕەبین و
مۆقلاشیشی نەبێ دەتوانێ لە رێی وردبینی و قوڵ بوونەوەی خۆی
بە ناو شیرازەی داوە باریکەکانی زماندا شوێن پێ خۆش کا بۆ گەشتی
سەرەوژوورتر بەرەو بنج و سەرچاوە کۆنەکانەوە ، هەرچەند بۆ
خۆی لەو بنج و سەرچاوانە زۆریش باخەبەر نەبێ . لێرەدا بە نموونە
دەڵێم یەکێك لەو مامۆستایانەی بە زمانەوە خەریك بوون ، لە عاست
چەند فیعلێکی وەك « چاندی ، ستاندی » لەسەر سوڕمان بەولاوە
شتێکی بە دەستەوە نەبوو چونکە ئەو فیعلانە لەو جۆرەن کە بە هۆی
ئەمرازی « اندن »ەوە بوون بە تێپەڕ ( متعدی ) دەوجا کە ئەمرازەکەت
لە فیعلەکە وەرگرتەوە چی ئەوتۆی لێ نامێنێتەوە پێی بگوترێ
فیعلی «تێ نەپەڕ» ، تۆ ئەگەر لە «چاندن» ئەمرازەکەی «اندن»ت

لابرد دەمێنێتەوە تاکە پیتی «ج» کە ئەمە دەست نادا ببێتە فیعل .
خۆ و تالع من بە هۆی پەیوندیمەوە لەگەڵ هەندێ عەشرەتەکانمان
ئاگاداری بنجی ئەو دوَ فیعلانە بوَم ، بنجەکانیان تا ئێستاش لە
نێوان ئەو عەشرەتانەدا بە کار دێن : دەڵێن «توتنەکە چنا ، زەویەکە
چنا » ، لە ئاینده ( مضارع )دا دەڵێن « توبلێی تا دوَ رۆژی تر ئەم پەلە
زەویەم بۆ بچنێ ؟ » . هەروەها دەگوترێ « هەقەکە بە تەواوی
ستنا ـ ئەم هەقە بە کەس ناستنێ » . خولاسە لەو مامۆستایەم
گەیاند کە « چاندن و ستاندن » لە دوَ فیعلی « چنان و ستنان »ەوە
هاتوَن ، وا دیارە بۆ مەبەستی سوَك کردنەوە پیتی « ن » لە صیغەی
تێپەڕدا بە هۆی «اندن»ەوە سواوە و لە جیاتی بگوترێ «چناندی و
ستناندی » ، کە ئەمە راستی فیعلەکەیە ، دەگوترێ « چاندی و
ستاندی » . بە نیسبەت مامۆستاکەوە دوَ کرێی گرنك لە
توَژینەوەیدا کرایەوە ، بەلاَم تا ئێستاش بە نیسبەت ئەو و منیشەوە
گرێی فیعلی « مان » کە وا لە ئاییندەدا دەبێتە « دەمێنێ »
نەکراوەتەوە چونکە بەپێی دەستوَری داڕشتن و وەرگرتنی فیعلی ئاینده
لە رابردووەوە دەبوَ فیعلی ( ما ) لە ئاییندەدا ببێتە « دەمێ » ، صیغەی
«دەمێنێ» تێپەڕە نەك تێنەپەڕ و دەبوَ لە رابردوَدا « ماندی » بێ وەك
کە دەڵێی « سوَتاندی ـ دەسوَتێنێ ، رژاندی ـ دەڕژێنێ » . دەوجا لێرەدا
بە نسبەت « ما ـ دەمێنێ » دوَ پرسیاری بێ وەرام دێنە پێشەوە :
یەکەم : دەبێ ئەسڵی « ما » چی بوَبێ و چی لێ قرتابێ ؟
دوەم : چۆن وابوَ صیغەی تێپەڕ « متعـدی » بۆ تێنەپەڕ
« لازم » بەکار بێت ؟

که زۆر ورد بینەوە دەتوانین ئەم پرسیارەش بکەین و بڵێین :
بە عادەتی دەستوری فیعلی روَدان « مطاوعە »ی وەك « رژا — دەرژێ ،
سوتا — دەسوتێ » لە صیغەی تاکی یەکەم « مفرد متکلم » و هەمو
کەســەکانی تردا ئەم « ێ »ەی کەسی سێیەمی تاك هــەر دەمێنێ و
ناپەڕێ . دەگوترێ « دەرژێم ، دەسوتێم — دەرژێن ، دەسوتێن »
کەچی لە هی (مانــ)دا ئەم ێیە بۆ کەسەکانی غەیری سێیەمی تاك
نامێنێتەوە . دەڵێی « دەمێنم ، دەمێنن » کەچی دەبوا بگوترێ
« دەمێنێم ، دەمێنێن » ئاخۆ ئەم جوداوازییە چییە و لەکوێوە
هاتوە ؟ تۆ بڵێی لە بنەڕەتدا « ماندن » نەبوبێ کە ئێستاش لە فارسیدا
هەروا بە کار دێت ؟ ئەگەر قەناعەت بێنین کە وا « ماندن » سواوە و
بوە بە « مان » گرێیەکان لە خۆوە دەکرێنەوە و صیغەی ئاینــدە
« مضارع »ی دەبێتەوە خزمی صیغەی رابردوَی و گەردانی « تصریف »
بەم جۆرە دەبێ :

| | |
|---|---|
| من ماندم | من دەمێنم |
| تۆ ماندیت | تۆ دەمێنیت |
| ئەو ماند | ئەو دەمێنێت |
| ئێمە ماندین | ئێمە دەمێنین |
| ئێوە ماندن | دەمێنن |
| ئەوان ماندن | |

ئەوسا ســەیریش لەوەدا نامێنێ کە «ی» کەسی سێیەمی تاك لە

« مضارع »دا بۆ کەسی یەکەم و دووەم و هەمۆ کەسەکانی‌تر خۆ بەدەر ناخاتەوە چونکە راستەوخۆ وەك فیعلی « مرد » حیســابی لەگەڵدا دەکرێ بێ زیاد و کەم :

| | |
|---|---|
| ئەو مرد | ئەو دەمرێت |
| من مردم | من دەمرم |
| ئێوە مردن | ئێوە دەمرن |
| ئەوان مردن | ئەوان دەمرن |

دەبینی لێرەشـدا « ی » کە نایێتەوە بۆ کەسی یەکەم و دووەم ، تەنانەت بۆ سێیەی کۆش هەر نایێتەوە . لە بەشی یەکەمی ئەم نوسینەدا باسی فیعــلی « مرد » و نە بۆنی بە « رۆداو — مطــاوعە » دەخوێنیتەوە ، چی دەربارەی « مرد » گوتراوە سەر لەبەری دەشێ دەربارەی « مان — ماندن » بگوترێتەوە . ئەوەی راستی بێ فیعلی « مان — ماندن » لە نوقتەی بەرامبەری « مردن »ەوە دەوەستێ ، واتای ئەو پێچــەوانە دەکاتەوە ، دەگوترێ « فلانەکەس ماوە یا مردوە ؟ » ئەمە فەرقێــکی نیــە لەگەڵ ئەوەدا کە بگوترێ « ماوە یا نەماوە » .

ئەم نمۆنەیەی لێرەدا خرایە بەر چاو بە خۆی و درێژەیەوە ، لە سۆد بەولاوە تێیدا نیە بۆ زمانزان و تێکڕای باسی زمان چ لە لایەن مێژوی زمانەوە بێ چ لە لایەن رێزمان و دەستورەکانیەوە بێ . بێ زیانی لە باسی وەهادا ناگۆڕێ بە زیان ئەگەر باسـەکە نیشانیشی نەپێکابێ چونکە توانای نیـە بە خۆی و هەڵەیەوە بە

سەر خەڵقدا بسەپێ ؛ دۆزینەوەی هەڵە بۆنی ، شتێك نیە لە بەر چاوی دەیان و صەدان زمانزانی کورد خۆ بشارێتەوە . لە حاڵێکدا باسەکە بە هەڵەش چوبێ دوو سوودی گەورەی هەر تێدا پەیدا دەبێ :

سوودی یەکەم لەوەدایە زیهنی زمانزانان بۆ هەندێ رێباز و پەنا و پەسێوی زمانی کوردیی دەبا کە نیگای تایبەتی خاوەنەکەی بۆیان چوە و لەوانەیە زیهنی یەکێکی‌تر لە خۆوە بۆیان نەچێ . تۆ سەیری « کریستۆف کۆلۆمب » ، بەرەو رۆژاوا کە نیشتە دەریای ئەتلانتیك بەو ئومێدە بوو لەوێوە بگا بە هیندستان ، هەر لەو باوەڕەوە بوو ناوی هەندێ جەزیرەی نا « جەزیرەکانی هیندستانی رۆژئاوا » چونکە وای دەزانی گەیشتۆتە هیندستان نەك ئەرزێکی‌تر . هەڵەی کریستۆف کۆلۆمب نەی‌توانی زاناکانی جوغرافیا بە هەڵە ببا و زوو زانییان ئەم زەویە دۆزرایەوەیە وڵاتێکی سەربەخۆیە و چ پەیوەندیی نیە لە گەڵ هیندستاندا .

سوودی دوەم لەوەدایە ، توێژینەوەی شارەزایانە ئەگەر ئەنجامی بێ‌هەڵەشی بە دەستەوە نەدا تیشك داوێژێ بە دەوری خۆیدا و بە بەریەوە هەیە راستە شەقامان روون کاتەوە و شوێن هەنگاوی خەلقی‌تر ئاشکرا بکا . بە نموونە دەڵێم فەلەکناسانی یۆنان کە گوتیان رۆژ سێ صەد هێندەی زەویی گەورەیە و لەو گوتەیەدا چوار هەزار جار بە سەهوو چوبوون دیسانەوە زیهنی خەلقی سەردەمی خۆیان و دوا خۆیانیشیان بۆ ئەو راستییە برد کە رۆژ لە زەویی گەورەترە بە پێچەوانەی رواڵەتی بەر چاو ..

نوسینێکی شارەزایانە تا دەگا بەو شوێنە کە ئەنجامی هەڵە بە دەستەوە بدا زۆر وردە تێبینی و سرنجی راستی دەربڕیوە کە تێکڕایان دەبنە سامانێکی تازە داهاتوی ئەو باسە . لە تەجرەبەی خۆم وا بوە ئەوەندە سوودەی پێم گەیشتوە لە خوێندنەوەی گوتارێکی ئەوتۆ کە لەگەڵ لێکدانەوە و ئەنجامەکانی رێك نەکەوتوم زۆر زیاتر بوە لەو سودە کە لە گوتارێکی سافیلکەی بێ قوڵایی کەم بڕشتم وەرگرتوە هەرچەند لە گەڵ باوەڕی خۆشم گونجاوە ، چونکە وردی و قوڵایی و شارەزایی گوتارەکەی یەکەم چەندین دەرگەی بە روومدا کردۆتەوە بۆ ناو ناوەرۆکی مەوزوعی پڕگرفت و گرێ و گاڵ کە ئەگەر ئەو نوسینە نەبا رەنگ بو بە زەحمەت یاخود بە درەنگەوە بۆم کرابانەوە ، لەوانەش بو هەر نەکرێنەوە .

خوێندنەوەی نوسینی ورد و قوڵ سەرەڕای وەدەست هێنانی زانیاری تازە بابەت و نهێنی ، گەشتێکی خۆشکەڵەش دەکا بە زیهنی خوێنەر ، دەست لە ناو دەستی نوسەر ، بە ناو ئەو دەربونە پێچەڵپێچانەدا کە زیهنی نوسەرەکە بە چرای تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی خۆی رونی کردونەوە . گەشتی راستە شەقامان کە درێژەی کێشا ، بە هۆی یەك ئاهەنگییەوە « رتابة » ، بیری گەشتەوەر کول دەکا و رای دێنێ بە رەوتی بێ گرفت لە رێبازی هەمواردا ئیتر کە هەنگاوی هەڵێنا لە ناو رێچکۆڵەی تەسك و بەرداوێدا یاخود دڕك و دار و خلیسك و هەوراز و نشێوی هاتە پێش خێرا ماندو دەبێ و توانای بزوتنەوەی نامێنێ . خوێندنەوەی نوسینی ورد و بە هێز و پێز بۆ ناو قوڵایی بابەت وەرزش بە مێشك دەکا و زاخاوی زیهن دەدا ، با

بلێم تیغی زەکاوەتی خوێنـــەر دەمەزەرد دەکاتەوە . وەك لێتـەوە دیاریشە ژیان و بەرەو پێش چوونی ، ساڵەو ساڵ لە زەحمەتی و سەختی بەرهەمی هونەری و ئەدەبی و زانستی زیاد دەکا . هەر بابایەو شیعر و پەیکەر و رەسمی نامەفهوومتر دێنێتە کایەوە و دەشڵێ « فەن بۆ گـەل نەك بۆ فەن » . وەنیە من چ رەخنەیێکم هەبێ لە جۆری (سازدان و بەرهەم هێنان ) کە هونەرمەند وە یا نوسـەر پەسندی دەکا ، تەنها لەوەدا ئیمتیرازم هەیە کە تیجارەت بە ناوی « گەل »ەوە بکرێت .
بەرهەمێك کە بە جۆری ســـەخت و نامەفهوم دەروونی خاوەنەکەی تەرجەمە کرد لەوە دەردەچێ بۆ گـەل بێ یا بۆ گەل نەبێ و دەبێ پێی بگوترێ « فەن بۆ راستی » بەو مانایە کە هونەرمەند نەخشەی هەست و تاسەی خۆی کێشاوە بە بێ فێڵ و بەو شێوازەی کە تێیدا پسپۆڕە ، گەل تێی بگا یا تێی نەگا . چ کەس گوناهبار نیـــە لەوەدا ئەم جیهانە پڕە لە پرسیاری سەخت و سەرکەش ، زانستەکانیش چ تاوانێـکیان نیە کە من و تۆ تێیان نەگەین . سروشت بە هەموو بارێـکیەوە و لە هەموو روێکەوە مەتەڵاوی و هـــەزار تۆژاڵە . ئەوەی دەیەوێ تێی بگا دەبێ خۆ ماندوو کا و خەریکی تێگەیشتنی بێ : ژیان و گۆڕان و بەرەو پێش چوون لە بەر خاتری من و تۆ خۆ سادە و تەنك و بێ بارست و قوڵایی ناکەن تا تێیان بگەین ، کە ئەمە بکەن دژی خۆیان رەفتار دەکەن . دەبێ من و تۆ لە تین و تاو و زیرەکی و تێگەیشتنی خۆمان زیاد کەین تاکوو لەگەڵ ژیان جووت بڕۆین ، گوتەی « بۆگەل » نابێ بکرێتە لەمپەر و بەرهەڵست لە بەر هەنگاوی گەلەکە خـــۆی . دەبێ کارێك بکرێ گەل لە

بەرھەمی سەخت بکا ئەو بەرھەمە لە ئەدەبدا بێ یا لە زانست یا لە ھونەر.

زمانیش یەکێکە لەو باسانە کە وا باری زەحمەت و لایەنی ورد و قوڵی تێدایە . هۆش و بیری مرۆڤ چەند بە توانایە لەوەدا بۆ خەیاڵی ورد و تێکەڵ و گرێیاوی و تێک‌هەڵکێش بڕوا زمانیش ئامادەیە لەو گوێرەیە دەستور و ڕێباز و رچەی باریك و گەوەك و تێك ئاڵقاو بخولقێنێ بۆ ئەوە بتوانێ ھەست و نەستی ھۆش و دەرونی مرۆڤ دەربڕێ . بەولای دەربڕینی واتاکانی دەرونی مرۆڤەوە ، زمان ناچاری دەربڕینی ئەو واتا و مەبەستانەیشە کە لە ڕێبازی تەجرەبە و زانستەکانی « تطبیقی و پیشە سازی »یەوە ڕۆژ بەڕۆژ لە پتربوندان ، ئەم کارەیش ئیمڕۆ و دوێنی بەرەنگاری نەبوە : لەوەتەی مرۆڤ بوە بە خاوەن ھۆش و تێگەیشتن و تەجرەبە و زانست و ھونەر و پیشە ، ئەرکی زمان و ئاخاوتنی بەرەو زەحمەتتری و گرانتریەوە ڕۆییوە و ھەر لەڕۆیشتندایە . ھەڵبەت ئەم حاڵەی بەردەوام بونی سەرەو زۆر چون و ورد و قوڵ بونەوەی بەرھەمەکانی « عقلی و تطبیقی » مرۆڤ بە درێژایی کات داوای لە زمان کردوە کە ئەویش لە ھەمو ڕوێکەوە بەرەو زۆر بچێ و ورد و قوڵ بێتەوە دەنا لە ڕەوتی « ھۆش و کردەوە »ی مرۆڤ دادەما و بە مەدا مرۆڤ خۆی پەکی بەرەو پێش چونی دەکەوت چونکە کە زمانی ئاخاوتن و تۆمار کردنی دابڕا لە تیژڕۆیی ھۆش و جوانکاری دەستەکانی ، کەرستە و ئەمرازی پاراستن و بیرھاتنەوە و تێگەیاندنی ئەو جوانکاریەی لە دەست دەچو .. مرۆڤ کە زمانی نەیتوانی ببێ بەتەرجومانی بیر و ھۆش و کردەوەی ، وردە وردە

دەبێتە گیانـ لەبەرێـکی (نەزۆکی عەقلی) و کانیاوی ئیلهامی وشـك دەبێ و یەکی جوانـکاریی و «ابداع»ی دەکوژێ، چونکە بلیمەتی و زانایی و زیرەکی و ئامادەیی مرۆڤ بـۆ داهێنانی واتای تازە و بەرهەمی نۆژەن و کردنەوەی دەرگە داخراوەکانی سروشت بە هۆی لە یەکتر گەیشتن و بە یەکتر گۆڕینەوە و هاریکاریی تاکەکانیەوە دەبێ: تا کە مرۆڤ ناتوانێ کانیاوی بێ بن لە دەروونی خۆیدا هەڵقوڵێنێ و وشکایی نەبێ. بە تێك کردنەوەی جۆکە و شەلەکە و چاویلکەی بیر و هۆشی ملیۆنەها تاکەکانی مرۆڤ بۆ ماوەی کاتی بێ ژانەوە ئـەم زانست و ژیار (حضارە) و هونەر و تێکڕای بەرهەمی (هـۆش و کردەوە)ی ئادەمزاد پەیدا بوە. شیرازەی بە یەکەوە بەستنەوە و بە یەك گەیشتن و تێك گەیشتن و هاریکاریی و هەرەوەز و هەمـوو چالاکیەکی کۆمەڵایەتی مرۆڤیش زمان و ئاخافتن بـوە. هەڵبەت لە بیرمانە ئاخافتن خۆی دەبێتەوە (نووسین)، واتە نابێ خەیاڵ بۆ هێندێ بڕوا کە وا رەنگە بتوو نووسین جێی ئاخافتن بگرێتەوە ئەگەر ئادەمزاد نەگەیشتبا بە داهێنانی ئاخافتن.

هەر چەند بمانەوێ ئیسپاتی ئـەوە بکەین کە (بێویـتی) و داخوازیەکانی ئابووریی و گوزەران مرۆڤی خستۆتە سـەر رێبازی گۆڕان و پێشکەوتن، هـەرگیز ناتوانین ئـەو گۆڕان و پێشکەوتنە لە قـەرزی زمان و ئاخافتن رزگار بکەین. هۆی بەرەوپێش چوونی مرۆڤ ئابووریی بێ یا غەیری ئابووریی، ئەو راستییە هەر دەمێنێ کە وا لە گوێـرەی پێشکەوتن و ئاڵۆزانی باری ژیان زمانیش بەرەوپێش چوە و دەستوورەکانی تێك ئالاون: بەو پێیە، زمان و ئاخاوتـنی

پلەی شوانکارەیی ناتوانێ ئەرکەکانی پلەی زانست و تەکنیك هەڵگرێ و فەرمانەکانیان جێبەجێ بکا ، زاتەن زمانیش لە پلەی شوانکارەیی نەوەستاوە لە حاڵێکدا مرۆڤ گەیشتبێتە زانست و تەکنیك . هەرگیز نەدەکرا و نەدەشیا کۆمەڵایەتی مرۆڤ لە رێبازی گۆڕانی ( مادی )دا بگا بە ئاسمانگەردێ کەچی ئاخاوتنی هەر ئەوە با کە لە قۆناغی ئاژەڵ لەوەڕاندندا هەبوو . تۆ لە لای خۆتەوە بەراوردێکی نوسینی کوردێ بەر لە ٥٠ ساڵ بکە لەگەڵ هی ئێستاکەیدا ، خۆ کورد جارێ لە باری ( مادی )یەوە ج قۆناغێکی ئەوتۆی نەبڕیوە ژیانی ٥٠ ساڵ لەمەوبەری لێ ببێتە بێگانە کەچی نوسینەکەی هێندە گۆڕاوە و بەرەوپێش چوە هەر دەڵێی پەیوەندێ خۆی پچڕیوە لەگەڵ ئەو رابردوە نێزیکەیدا[۳] . بێ گومان گۆڕان و بەرەوپێش چونی نوسینی کوردێ کە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی و ( مادی )یەوە سەری هەڵ نەداوە ، بە هۆی وەرگرتنی زانست و رۆشنبیری نوێوە بوە کە وا بە حازر و بزرێ و بێ پەك کەوتن لە سەر ( گۆڕانی کۆمەڵایەتی ) لە جیهانی پێشکەوتوەوە بۆی هاتوە . هەڵبەت من نامەوێ بڵێم ج گۆڕانێکی مادی و کۆمەڵایەتی لە نێوان کورددا پێك نەهاتوە چونکە دیارە گونەی وەها بێ بایەخ و بنجە ، بەلام ج گومانیش نیە لەوەدا بەرەوپێش چونی نوسینی کوردێ لە رێبازی خوێندنەوە و رۆشنبیرێ نەوباوی ئەوروپاوە ج خزمایەتێکی نیە لەگەڵ ئەو هێندە پێشکەوتنەی کە چاوەڕوان

(۳) لەم گونەیەدا تەنها مەبەست شێوازی نوسینە نەك ئاخاوتن .

دەکرێ لەو کەمە گۆڕانە مادی و کۆمەڵایەتییە رەسەنە کە لە کوردستاندا پەیدا بوە . زمان چونکە تەرجومانی هۆش و دەروونی مرۆڤە هەوڵ دەدا ، لێشی دەوەشێتەوە ، بگا بەو پلەیە کە هۆش و دەروون پێی گەییوە تا بتوانێ مەبەستەکانیان دەربڕێ ددوجا چ فەرقێك نیە بە لای زمانەوە لەوەدا هۆشی مرۆڤ لەرێی گۆڕانی مادی و کۆمەڵایەتییەوە گەیشتبێتە پلەیێکی هەوراز یاخود لە رێی خوێندەواری و رۆشنبیری مێوان و تەرجەمە کرایەوە ، کە وا بە ئەسل لە واقیعێکی پێشکەوتوەوە سەری هەڵداوە . بۆ خۆت دەبینی زمانی کوردی ، وەك هەمو زمانێکی تر ، چەند بە خێرایی پێش دەکەوێ لە مەیدانەکانی « نظری »دا بە هۆی « ممارسە »ی بیر و باوەڕی ئەو مەیدانە « نظری »یانەوە ، کەچی چ هەنگاوێك بەرەوپێش نەچوە لە دانانی ناوی تازە داهاتودا بۆ هەزاران ئەمراز و رشتە و پارچەی جودا جودای دروست کراوێکی وەك فڕۆك . تۆ بڵێ کەی دەتوانین بە کوردی باسی « کۆمپیوتەر » بکەین بەخۆی و ناوەرۆکە قەڵەباڵغ و پڕ لە ئەمرازەکەیەوە هەر وەك باسی مێژوو و فەلسەفە و تیۆریەکانی سەر بە کومەلایەتیەوە دەکەین ؟ تا ئێستا چەندین زاراوەی جودا جودا بۆ باسەکان و بەشەکانی رێزمانی کوردی کەوتوونە سەر زار و ناو نوسینەوە تا وا بوە یەك عینوان دوو سێ زاراوەی بۆ دانراوە وەك وشەکانی « فرمان ، کار ، کردار .. » کە وا بۆ زاراوەی « verb ، فعل » بە کار دێن .

پوختەی قسە ئەمەیە ، لەگەڵ بەرەو پێش چوونی ژیان بە هەر دوو باری مادی و نامادییەوە زمانیش لە خۆوە بەرەوپێش دەچێ و

لە گوێرەی ئاڵۆزان و وەزەحمەت کەوتنی ئەو مەوزوعانەش کە زمان لێیان دەدوێ ، ئاخاوتن بەرەو زەحمەتتر بون و وردتر و قوڵتربونەوە دەڕوا کە ئەمەش بەرهەمێکی کوتومت و ناچاری گۆڕانی ژیان و زۆر بونی گرفتەکانیەتی . لەمەشدا زمان ســـەختی و زەحمەتی نوێ دەخاتەوە سەر ســـەختی و زەحمەتی کۆن کە لەبنەرەتدا تایبەتی و سروشتی ئاخاوتنە بە هۆی ئەوەوە کە تەرجومانی هۆش و چالاکیە پڕ لە تێك هەڵکێشان و ئاڵقاندن و رایەڵی باریك و وردیەتی.

سرنجێکی سەرپێیی لە زمانە پێشکەوتوەکانی جیهان دیمەنێکی سەرسوڕهێن دێنێتە بەر چاوی بینەر لەوەدا کە باس و دیراسە و لێکوڵینەوە لەم زمانانەدا هێندە زۆر بوە بـــە ســـەر یەکتردا کەڵەکەیان کردوە و مرۆڤ پێی راناگا سەرە باسەکانیان بخوێنێتەوە چ جایی هەموو کتێبەکانیان . لەگەڵ ئەمەشدا نوسین لەسەر بابەتی ( Linguistics ) رۆژ بە رۆژ لە پتر بوندایە لەوەش سەیرتر : تا ئێستا بیر و باوەڕی زمانزانەکان دەربارەی زوربەی ئـەو باسـانە کە لێیـانەوە دەدوێن یەکتر ناگرنەوە . وا دەبێ زمانزان بـــۆ خۆی باوەڕگۆڕی دەکا و سبەینێ نوسینی ئیمڕۆی دەسڕێتەوە . تاکە وشەی ( Linguistics ) چەندین تەعریفی جودا جودای بۆ دانراوە . سەیرێکی کتێبی « What is Linguistics » لـە دانانی « David Crystal » بکەیت دەبینی لە چەند ســـەرچاوەیێکی گرینگی زانستەوە نمونەی جوداوازی ئەو تەعریفانەت بۆ دێنێ و بـــەدوا ئەوەدا نازەزایی خۆیشی دەردەبڕێ لە عاست هەموویاندا . زمانی عەرەبی کە وا لە

ماوەی پتر لە ١٢٠٠ ساڵ پێش ئێستاوە تا ئیمڕۆ لەسەر فەرهەنگ و « فقه » و رێزمان و هەمۆ بارێکیەوە دەریا دەریای کتێب دانراوە هێشتان ئەوەندە لیلایی و گرفتی تێدا ماوەتەوە کە نوسەرانی ئیمڕۆی عەرەبی ، وەك « بصري و کوفی »یەکانی کۆن ، لە میانی خۆیاندا نەتوانن رێك کەون لە سەر گرتنە بەری تاکە رێگەیێك و باوەڕێکی یەك گرتۆ لە رێزمان بە تایبەتی و لە سەر جوملەی باسەکانی زمان بە تێکڕایی .

بێ گومان حاڵی زمانێکی خزمەت نەکراوی وەك کوردی گەلێك زیاتر لەو زمانە خزمەت کراوانە جوداوازی بیر و باوەڕ هەڵدەگرێ ، چونکە ئەگەر لەو زمانانەدا رێك کەوتن پەیدا بۆبێ لە سەر هەندێ باسەکانیان بە هۆی زۆر لێ دوان و جێوانەوە و دەمەتەقە و راست کردنەوە و لێکۆڵینەوە ، لە کوردیدا هێشتان چی ئەوتۆ لە سەرەباسەکانی قەراردادە نەبوە بە جورێکی وەها کە لە دەمەتەقەی هەڵاوێرێ . بە نمونە دەڵێم یەکێك ئارەزۆ بکا دەتوانێ « کارا و جێ گری کارا - فاعل و نائب فاعل » بخاتە ژێر عینوانێکەوە و دەشتوانێ بۆ هەر یەکەیان ناو و عینوانێکی سەربەخۆ دانێ لە رێزماندا .

تۆمار کردنی بیر و باوەڕ و بڵاوکردنەوەی بە نێوان رۆشنبیر و خاوەن بیر و باوەڕاندا سەرەڕای ئەو سۆدانەی تا ئێستا لێی دواین ، سۆدی تریشی هەیە لەوانەی پشت گوێ ناخرێن : زیهنی خاوەن بیر و فەلسەفە ریکۆردەر نیە بتوانێ بۆ ماوەیێکی بێ کۆتایی

هەڵیان گرێ و بیان پارێزێ ، کە تۆماری نەکردن وردە وردە لە یادیان دەکا . جا ئەگەر شتی بە نرخیان تێدا بێ لە کیس خۆی و خەلقەکەش دەچێ . تۆ کە ئێستا شتێکت نوسی و لە فۆتانت پاراست[٤] ، سبەی رۆژ خۆت و نوسەرانی تریش دەتوانن لێی زیاد کەن وە یاخود هەڵەکانی راست کەنەوە ، واش دەبێ هەندێ تێبینی ورد و قوڵ لە نوسینەکەت ببێنە روناکی کە تاریکایی شوێنی تر لە نوسینانندا بڕەوێنێتەوە . تۆ پێم بڵێ کام مەیدانی رۆشنبیری کورد گەشتی نیوە چڵی تێدا کراوە تاکو لە رێی خۆ داین کردن بە « قەناعەت »ەوە یەخەی بەردەین و بڵێین چی تری بێ ناوێ ؟ سەرە باسە زلەکانی رۆشنبیری « کورد ناسی » بە مێژوو و ئەدەب و زمان و کۆمەڵایەتی و هونەر و فۆلکلۆریەوە ، هیچ کامێکیان لە بەرکوڵێك پتر لێیان ئامادە نەکراوە ، تێیاندا هەیە کەس لە بەرکوڵیشی نەخواردوە . کە دەڵێم ( بەرکوڵ ) ئەوەت لە بیر نەچێ قازانی چێشتەکە گەلێك لە قازانی عادەتی زلترە .

کارێکی زۆر پیرۆزی نوسین ، بە نیسبەت تێکڕای بزوتنەوە و رابەڕینی رۆشنبیری کوردەوە ، لەوەدایە تۆڵەی بێ نوسینی لێرە بە پێشەوەمان دەکەینەوە و جیلەکانی دوا خۆمان لە سەرسوڕمانی وەك ئێستاکەمان رزگار دەکەین هەر نەبێ لە ئاست ئەم سالانەی ئێمەی

(٤) شاعیری عەرەب راستی کردوە لەوەدا کە گوتوەتی :

کل سر جاوز الاثنین شاع
کل علم ما حوته الکتب ضاع

دەشڵێن مەبەست لەم « اثنین »ە دوو لێوە نەك دوو کەس .

تێـدا دەژین . چەندین کەس لە کوردان خەریکن پەڕە شڕی کۆنە کتێبەکانی پەڕا و پەسێوی مزگەوت و تەکیە و مەزارەکان ئەم دیو ئەو دیو دەکەن بەڵکو ، خوا و راستان ، لە دێڕێـکدا یاخود لە وشەیێـکدا هەواڵێکی پێش خۆمان بۆ دەردەست بکرێ وە یاخود نیوە ئیشارەیێك بۆ روداو وە یا زانست وە یا هەر شتێکی تری سەر بە کوردایەتییەوە بێ لە بن بێژنـگی تۆژینەوەدا بێنێتەوە و سودێـکی لێ وەربگیرێ . لە بەشێـکی ئایندەی نوسینم لەسەر حاجی قادری کۆیی دەخوێنیەوە چ موژدەیێـکی گیان بۆژینەوەم لە چەند دێڕێـکی « مـەلای ئیبنو ئادەم »ەوە وەرگرت کە لە سـاڵی « ١٢٠٥ »ی کۆچی‌دا بە پێی داخوازی جێـگە چەند جاران ناوی کورد و کوردی و کوردستان دێنێ .. « سلیمانیه » بە « مقر سلطنة کردستان » دادەنێ و ئەوکەسانەی کە عەیب دەگرن لە نوسینی کوردی دەیانخاتە ژێر مەفهومی ئەو پەنـدەی کوردییەوە کە دەڵێ « وەك هێلـکە لە توێـکڵی خۆی دەرچوە » .

نوسین ، بێ زیاد و کەم ، دەرکردنی تەزکەرەی نفوسـە بۆ ئەو رۆژگارە کە نوسینەکەی تێـدا دەکرێ . رۆژگارێك کـە وا بەر نوسین و تۆمار کردن نەکـەوتبێ زێدنامە « شـهادە الجنسیە »ی نیە و ناناسرێتەوە . حاڵی زمانیش وەك حاڵی تێـکڕای ئەو بابەتانەیە کە لەوانەن لە سەریان بنوسرێ . پەنجا ساڵێك دوای ئیمڕۆ کە وا حاجی قادر گوتەنی « ئێمـە دەمرین و دەبینە خاکی سەرەڕێ » و جوامێرێـکی کوردی ئەوسا خەڵەت و پەڵەت و راست و

دروستی نوسینی ئەم رۆژگارەمان دەخوێنێتەوە و بەراوردیێکی دەکا لەگەڵ بۆ نوسینێ لێرە بەپێشەوە ، چەندێکی لێویشی هەڵقرچێنێ لە خەڵەتەکان ، درۆدێك هـەر دەنێرێ بۆ گیانی نوسـەرەکان ، بە دوا درۆددا لێی دەوەشێتەوە بشسەلمێنێ کە وا بەشێکی نیشانە پێکانی خۆی قەرزداری ئەم خەڵەت و پەڵەتانەیە .

بە دوا خوێندنەوەی سەر لەبەری ئەم تێبینییانە لێت چاوەنۆڕ دەکەم ، ئەی خوێنەری کوردیی عاشقە زمان ، خۆش ئامەدیی بکەیت لە زۆر بونی نوسین و لێکۆڵینەوەی زمانزانانە وە تەنگیش نەبەیت لە درێژە کێشان و وردکاریی ئەو نوسینانە . بایەخ دانی کۆڕ بـەم تەرزە بەراوردیی و تۆژینەوە و سرنج گرتنی قوڵ و نەفەس درێژ کە لەم نیمچە کتێبەدا دێتە بەر چاوت لە سەر جوملەی تێبینی و رۆن کردنەوەی ناو ئەم پێشەکییەوە هاتوە ، منیش بە هەمان رێبازدا بۆ هەڵگرتنی ئەرکی ئەم نوسینانە رۆیشتوم بەو نیازە خزمەتێکی تێر و پڕی رێزمانی کوردیی بکرێت ، لەویشـەوە هی تێکڕای رۆشنبیریی کورد(*) .

* * * * *

---

(*) بەشی یەکەمی ئەم کتێبە لە زمارە یەك و بەشی دووەمی لە زمارە دوّی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »دا بلاّوکراونەتەوە .

## بەشی یەکەم

# بەکارهێنانی «ی» لە ڕێزمانی کوردی دا

زمان وەك نیشانەی هەرە ئاشکرای زیندوەتیو هۆشیاریی مرۆڤ، گەلێك باری ئەندازیارانەو زانایانەی ئەوتۆی تێدایە لەوە ناچێ بە جۆرێکی عەفویو لە خۆوە پەیدا بوبێ هەر دەڵێی پسپۆڕو ئوستاد دروستیان کردوە. مەبەسم لێرەدا ئەو زاراوو ڕستەو دڕشتنانە نیین کەوا دوای گۆڕان و فراژوێتی و شارستانەتی لە زمانێك دا پەیدا دەبن چونکە دیارە بەرهەمی ئەو پلەیە سەرکەوتوەی زمان دەبێ بەرهەمێکی ڕێکو بە پێی دەستورو ڕێزمان بێ: مەبەسم ئەو دروشمە پڕ ژیریو پسپۆڕیەیەکە لە زمانی پێش پلەی شارستانەتی و زانیاری نوێ دا بەدی دەکرێ.

با لە (تعمیم) خۆ دەر خەم بو (تخصیص) ولەباری زمانی کوردیەوە بدوێم.

وەك دەزانێن لە ماوەی چەند صەد ساڵێکی ڕابوردو دا زمانی ئاخاوتنمان لە بنچینە دا گۆڕانێکی بەسەر دا نە هاتوە دوریی خاتەوە لە زمانی نوسینمان. لە چەند وشەیێکی تازە دروستکراوو هەندێك

لاسایی راوێژی رۆژاوا بەولاوە چتی نوێی تێدا نیە جیاوازی کاتەوە لە زمانی کوردەوارتی ١٠٠ ـ ٢٠٠ ساڵ لەمەوبەر : بەیتی عـەلی بەردە شانتی و هەلبەستەکانی کوردتی و نالتی و حـاجتیقادر چ فەرقێـکیان نیە لەگەل وتووێژی ئێستاکەمان ، ئەو فەرقە نەبێ ئەوان لەسـەلیقەوە نزیـکتر قسـەیان کردوە ئێمەش لەبەر خۆ پاراستن لەوشەی بێگانە وادەبێ دەڵێـی زمان دەگرینو بە وشە دادەنوسێین .

ئەو کوردیەی خۆمان کە گۆڕانێکی شـارستانتی و زانستی ئەوتۆی بەسەر دا نەهاتوە یەکتی بخا لەوەی ببێ بە نمونەی رەسـەن بۆ داڕشتنی ئوستادانە ، وەك سرنج دەرتی دەخا تا بڵێـی دەوڵەمەنـدە لە رۆی رێـکتیو ئەندازە و وردە کاریەوە . گەلێ جار بەدەست خۆم نیە هەستی شانازتی دەکەم لەوە دا کە زمانی نژادەکەم ئەوەندە زیرەکتیو موقلاشتی تێدا بە کار هـاتبێ و لەگەل خـۆم دا دەلێمەوە میللەتێك تواناییێتی لە مەیدانی زمان دا بەو رادەیە ژیرانەو جوانکارانە بنیادی تعبیری دانابێ داخوا ئەگەر لەهەمو مەیدانێکی دروسـت کـردنو بنیادنان دا ئازادتیو دەسەلاتتی تەواوتی هەبا دەبوا چ بەرهەمێك بۆ خۆیو ئـادەمیزاد بێنێتە دتی . کورد لەگـەل ئەو هەمو دیواری بەندیخانەی دەوریو کـۆتو زنجیری دەسـت و پێـی تواناوەتی موافقی سروشتی داهێنەرو سەلیقەی راست و رۆناك رێبازی ئەوەندە هەموار بۆ ریزمانو رشتەی واتادەربڕین تەخت کاکەوا بە تێپەڕینی صەدان ساڵ لە ژێردەستتی و بـێ خزمەتتیدا کـوێر نەبێتەوە ، هەر دەڵێی یارێـگەی رۆمەکانە لەبەر مەحکەمتی و ئەندازەی باتیمەتـانە

زمانە نەیتوانیوە لەناوی بیا . کوردی گوتەنی ، بێ لەگەمە ، جێی
سەر سوڕمانە کەوا زمانەکەمان بە جۆری ئێستاکەی لەلانی جوانی و
دامەزراویەوە لە چنگی دڕندەی ڕۆژگارو ڕوداوە سامناکەکانی
ڕزگار بوە . نەك هەر زمان بەڵکو وابوە میللەتێك خوێشی لەناو
چوە لە ئەنجامی روداوی کەمتر ناخۆش لەوەی بەسەر کوردا هاتوە .

هەرچەند ئێرە جێگەی لێکۆڵینەوەی ئەو هۆیانە نیە کە کوردو
زمانەکەی پاراستوە ، بەلام نەفۆتانی کوردو زمانی باسێك نیە
بەوەندە لێی ببیەوە بڵێی وا ڕێك کەوتو ...وا قەوماو نازانم
چی : هەر لە وەندە تێفکرە کە سوپای ئیسلام فارسەکانی پێچایەوە
لە هەمو خاکی کە ئێستاکە پێی دەگوترێ عێراق تاکە شوینەوارێکی
فارسی تێدا نەمایەوەو هەموی وردەوردە بو بە عەرەب . بەلام
هەرێمی کوردستان لەگەل ئەوەش دا کە کورد حکومەتو سپای
بەرگریشی نەبو هەر مایەوە بۆ کورد بە کوردی . وا دیارە ڕوداو
تاکە هۆی کارکردن و ئەنجامدان نیە ، ئەوەی روداوەکەی بە سەر دا
دێ دەبێتە کەرتێکی ( معادلە ) ی مێژوویی . بۆ میسال بابلێین بەردێك
بەسەر شتێك دا بەربۆوە : قورسی و سوکی بەردەکەو ماوەی سەرەو
ژێر بونەوەی کاری خوێ دەکا ، بەلام چەندو چۆنی و رەقی
ونەرمی ئەوشتەی دەکەوێتە ژێر بەردەکەوە تێکەڵی روداوەکە دەبێ ،
ئیتر لە نتیجەی بەیەككەوتنەوەی هەر دویان دەردەکەوێ داخوا
کاریگەری ئەمیان یا بەرگرتنی ئەویان زیاترە . لەوانەیە ئەگەر ئەو
شتەی خۆی گرت لەبەر تاوی بەردەکە کەمتر نەرم با وەیا بێهێزتر

با وردوخاش بتوبا . گەلا نیش بەرامبەر کاردساتی مێژوو هەر وان : گەل هەیە توانایی بەرگری لە یەکێکی دیکە زیاترە ، جا هـۆی ئـەو زێدە بەرگریە هەرچی دەبێ بابێ . مەیلێکی ئاشکرای فراوان هەیـە لە نێوان خاوەند رایان دا بۆ ئەوە بگوترێ مرۆڤ بە تێکڕایی چون یەکن و وەك یەك ملکەچن بۆ یاسای گۆڕان و پێش کەوتن و پاش کەوتن ، بەلام ئەم مەیلە لە چاوگەی (خۆش ویستنی مرۆڤ) ەوە هەلدەقولێ نەك لە واقیع وەیا زانستەوە : مومکین نیە ئـەو گەلانەی لە جێگەی جیاجیا ژیابن و روداوی لەیەکدی جیا کاری تێ کردبن ، لە ئەنجامی هەزاران سالی ئەو جیاوازیە هەر وەك یەك بن لە روی هێز و توانایی و قابلیتەوە . ئەوەی لێرە دا وا بە کورتی و سەرپێیی دەیلێـم لە رەگەز پەرستیەوە نیـەو ناشچێتە پال ئــەو فەلسەفـەی دیواری هەلاوێردن و جیاکردنەوە لە میانی مرۆڤ دا دروست دەکا : خــۆ زۆر ئەشکرایـە میللەتانی دواکەوتو لەمەیـدانی رەگەز پەرستی دا دەیێکی میللەتانی پێش کەوتو هۆی شانازی و خۆهەلدانەوەیان نیـە . کەواتە جگە لەوە رەگەز پەرستی لە خۆی دا کارێکی چەوتە ، بـە نیسبەت میللەتی دواکەوتو دەچێتە ریزی خۆکوژیەوە . ئەوەی مەبەسی منە لە دەربڕینی راستی ، لەو باوەڕەوە سەر هەل دەدا کەوا رێگەی کامرانی دەر ناکا بۆ مەلبەنـدی ئاوات و ئومێــد ئەگەر لە زەمینی راستیەوە نەڕوا . بەلای منەوە خـۆ بە سـەهو بـردن لە واقیـع ئەنجامەکەی هەلدێرانە .. کلۆلیە . هەر بۆیەیشە پەروام نیە لەوە کە ناوناوە بە پێی داخوازی رون کردنەوەی بابەت بەم لاو بەولادا سەر خوار کەمەوە و هەندێ جار تا کۆتایی ریچۆلەیێکی فەرعی بڕۆم و

نوسەرەوە لەگەڵ نەختێك زانیاری یاریدەر بێمەوە ناو شەقامی ئەسڵی نوسینەکە .

وا لێرە دا یەکێك لەو ڕێچکۆلانە بانگهێشتنم دەکا تا گەشتێکی کورتیلەی تێدا بکەم .

لە سەرەتاوە گوتم ئاخاوتن ڕێزمانی پسپۆڕانەی تێدایە ، ئێستاکە ئەوەش ئیزافە دەکەم‌و دڵێم ئاخاوتن لە پلەیێکی یەکجار زۆی پژانی هۆشی مرۆڤەوە دەست دەکا بە پێش‌کەوتن‌و ڕێك‌کەوتن . لەو مەیدانە دا ئاخاوتن ماوەیێکی زۆر درێژ پێش دەکەوێتەوە لە کردەوەو بەرهەمەکانی دیکەی مرۆڤ وەك چاندن‌و مەڕداری‌و کشت و کاڵ‌و پیشەسازی‌و خانوکردن‌و ئەنواعی هونەرو رستن .. بگرە گۆشت برژاندن‌و چێشت لێنان . پێویست نیە بۆ میسال هێنانەوە بگەڕێینەوە بۆ مێژۆی کۆن‌و تاریك چونکە ژیانی ئەوڕۆمان پڕە لە میسال : بەشی زوری عەشایری کورد تا ئێستاکەش لە خانوی نازێك‌وپێکی ئەوتۆ دا دەژین فەرقێکی چەندانی نیە لەگەڵ هێلانەی مەل‌و لانی هەندێ جانەوەر . بۆ خۆم لە ناوچەی ناودەشت‌و هەرێمی جەلك‌ومەمك لە قەزای رانیە خانوم دیوە بەرزایی دەرگەو بانەکەی لە گوێرەی بلندی بالای ئەو ئاژەڵە بوە کە خانوەکەی بۆ دروست کراوە ، جا ئەگەر بۆ مەڕ کرابێ ڕەشەوڵاغی تێوە نەچوە . خاوەنەکەی دەبوا بالای خۆی دوَ کەرت بکا ( بچەمێتەوە ) تا دەچوە ژوَرەوە لەژوَرەوەش هەر بە چەماوەیی هات‌وچۆی بۆ دەکرا : سەر بەرزکردنەوەو خۆراست کردنەوە لە ئیمکان دا نەبو . ئەمە لانی بەرزایی ، خۆ لە لایەن

جواتیو ئەندازەو هونەرەرە هەر بە جارێ هێچ . ئەم عەشیرەتەی وا سەرەتایتی لە مەیدانی گۆڕانی ماددی، و پێشکەوتنی کومەلایەتی دا لە قسەکردن و ئاخاوتن دا ریزمان پەرست و ئەندازیارێکە تاکتی نەبێ. با میسالی لە وەش ئاشکراتر بێنین بۆ رۆن کردنەوەی مەبەس : مندالْ هێشتا بە سەر پێیان نەکەوتوە دەست دەکا بە گڕوگالْی قسەکردن . بەر لەوە بچێ بۆ قوتابخانە ئەوەندەی باوكو دایکی شارەزا دەبێ لە ئاخاوتن . وا بوە لەبەر مەلەکەی بەراوردی کردنو بەیەکدی گرتن (مقارنە ومقایسە) مندالْ دۆچاری هەلە بوە لە قسەکردن دا : بیستومە مندالْ گوتوەتی (وەرم ؟) کە ئەمەی اشتقاق کردوە لە فیعلی (وەرە) لە رێی بەراوردی کردن لەگەل فیعلی دیکە دا ودك (بخۆ ، بخۆم ؟ — برۆ ، برۆم ؟ — بشۆ ، بشۆم ؟ — هتاد) . ئا ئەم مندالە هێشتا نە دەستی قەلەمی گرتوەو نە تواتیوەتی دۆ شەتلە باینجان بچێنێ لە دێراوێك دا . دەوجا بۆ دەبێ مرۆڤ ئاخاوتنی زۆترو پێش کەوتوتر بێ لە بەرهەمەکانی دیکەی ؟ .

وەلامی ئەم پرسیارە رێچکو لە فەرعیە کەیە کە بانگ‌هێشتنم دەکا .

ودك من بۆی دەچم هۆی ئەم زۆ و دردنگی‌یە لە سروشتی ئاخاوتنەوە هەلوەستێ .

سرنج دەری دەخا ئاخاوتن براجرانەی (توأم) هۆشە . لەو ساوە هۆش پەیدا بوە ئاخاوتن پەیدا بوە : هەر بایتی ئەوەی براجرانەیێك لە کاتی زان دا دوای براکەی دیکە دەکەوێ ئاخاوتنیش دوای هۆش دەکەوێ . ئەو پەیوەندی ماددیو نیسبەتی برایەتی کە

نە میـــانی هۆش و ئاخاوتن دا هەیە بەدتی ناکرێ لە میانی هۆش‌و هیچ بەرهەمێکی دیکەی، هۆش . ئاخاوتن‌و هۆش ئەوەنـدە لە یەکەوە نزیکن‌و بەیەکەوە لـکاون هەر دەڵێی دوو رووی یەك سککەن ، بۆیە بە جۆرێکی عەفوی‌و بێ ئەرك‌و خەریك‌بون هەر لە سەرەتاوە ( سەرەتای پەیدابونی هۆش پێش هەزاران ساڵ یاخود سەرەتای عومری‌منداڵی) بەرادەی پڕانی هۆش ئاخاوتنیش دەگەشێ‌و دەکرێتەوە . وەك هۆش‌و ئاخاوتن بە موازاتی یەکدی دێن هیچ بەرهەمێکی دیـکەی مرۆڤ بەو موازاتە نایێ لەگـەل دۆش . هەمان سروشتی رێك‌خستن‌و ریزکردن‌و دەستور دانان کە هۆش هەیەتی ئـاخاوتنیش راســـتەوخۆ دەیبێ : هەردووکیان لە یەك سەرچاوە هەلدێنجن . تەنها زمانە بتوانێ هەمو ورتەو خورتەو خـەیاڵ‌و وەســـوەسی هۆش ترجمـە بکا بەجورێـکی پێت‌بەپێت‌و لە هەمان‌کات . جگە لە زمـان ئەمرازێك یا ئـەندامێکی لەش یا هەر هۆیەك بێ ناتوانێ راســـتەوخو و کوت‌ومت بە پێی جوڵەی هۆش دەســت‌هەلێنج واتـا دەربڕێ . تۆ لەوە گەڕێ دوای هەزاران ســاڵ لە گـۆڕان‌و پێش‌کەوتن مرۆڤ گـەیشتۆتە پلەیێك لە ژیری‌و شارستانەتی بتوانێ بە هۆی رەســم‌و هەلـکەندن‌و مۆسیقاو دانس‌و رەمز تعبیر لە ئەندەرونی بدانەوە ، چونکە ئێمە قســـە لە ســەرەتای پەیدا بونی مروڤ‌و مروڤایەتی وهۆش‌و راگەیاندن دەکەین نەك لە پلە هەلـکشاوەکانی پێش‌کەوتنی . بەلام لە گـەل ئـەم هەمو پێـــش کەوتنەو داهێنان‌و تەکنیکەش‌دا کە مروڤ پێکی‌هێناوە دوو جیاوازی گەورە هەیە لە میانی ئاخاوتن‌و هۆیە کانی دیکەی تعبیر :

یەکەم : وەك ئـاخاوتن بە ئاسـاتی و ئاشکرایتی و دەس بەجێ واتــاو مەبەسی هۆش دەردەبڕێ هۆیەکانی دیکە بەوجۆرەو نزیـك لەوجۆرە ئامادەی واتـا راگـەیاندن نین . نەك هەر ئەوەندە ، بەڵکو هەر ناتوانن بە هیــچ جۆرێـــك وەك ئاخاوتن ببن بە ئەمرازی خوشجلەوی رێزمانی و سەلیقـتی بۆ تعبیر : بەخەلق هەمو دەبن بە رسام و پەیکەرتراش و مۆ-یقار ، نە دیچ پارچەیێکی هونەری ئەو هونەرانە لە واتایێکی تایبەتی محدود بەولاوە بە دەســتەوە دەدەن : پەیکەرێك کەواتای (ترسـان) ببەخشێ امکان نیە ببێ بە (ترسام ، ترسنۆك ، مەترس ، ترسولەرز ، مەیانترسێنە ، ترساندمت . . هتاد) و تێکەڵ بە رشـتە ببێ و بەشداری بکا لە واتای جوڕ جۆر . هەر وەهـــا پارچەیێکی مۆسیقاو رەسمو دانسیش . .

دوەم : هەرچەنـد هـۆی جیـا جیا بۆ تعبیر پەیـدا بـوبـێ دیسانەوە وەك ئاخاوتن نین کە شان بە شـانو جۆت لەگەل هـۆش بێنو لە سەرەتای عومرەوە مرۆڤ فێریان ببێ وەك فیزی ئاخاوتـن دەبێ . ئەو هۆیانەی کەتازە بە تازە پەیدا دەبـن بۆ تعـبیر گەلێـك زەحمەتترو گرێیاوێترن لە کشتوکال ورااو و مێوە چنینو بەقالیو قەسابی . تاك تا کە نەبێ خەلق هەر نایانزانێ و فێریان نابێ . بگرە تێشیان ناگا .

برایەتیو خزمایەتی تاخاوتنو هۆش نەك هەر لە روی رێکیو دەستور خوازیەوە ، بەڵکو لەباری (سلبی) شەوە خـۆ دەنوێنێ : لە ئاخاوتن دا ( استثناء ) و نارێکی و چەوتی دەدیتێرێ ، هەروەها هۆشیش بەسەهو دەچێو بڕیاری هەلە دەداو باوەڕی چەوت دادێنێ.

هەلەو چەوتێی باوەڕو ئاخاوتنیش کەپەیدا بۆن تا راست دەکرێنەوە وەیا دەسڕێنەوە زۆرەکی زۆری دەوێ . هەروەهاش تێ هەڵچوون بۆگەیشتن بەسەر رشتەی ئەو چەوتێو هەلەیە لەبیرو باوەڕو ئاخاوتن‌دا ئەوەندە دوورو قوڵان دەبا سەرەدەرێ لێ‌نەکەین : لەفەرزی مەلەوانی ئەو گۆمەش بێن‌و بمانەوێ بگەین بە چاوگەی سەرۆی باسەکە لەم مەقالەیەدا هەر نایگەینێ . کەواتە بالێرە بەولاوە بچینەسەر ڕێبازی ئەساتێ نوسینەکەو لەپێشەکێو لاباس‌و تمهید وازبێنین .

وەك زانینی سەرەتایێ وایە مجادلە هەل ناگرێ کە دەلێم زمان بۆدەربڕینی واتا جگە لەوشەو رشتە ئەنواعی پیت‌و ئەمرازیش بەکار دێنێ . مەبەس لە ( پیت ) لێرەدا پیتی ( املاء ) نیە بەلکو پیتی رێزمانی‌یە کەهەندێ جار نرخی ناوی دەبێ چونکە مومکینە پیتێك ببێ بە راناو وەك لە گوتەی ( دیتم ) دا پیتی ( م ) بو شەخسی یەکەم دەگەڕێتەوەو دەلالەتی ( مرۆڤ ) ی هەیە .

دەبینێ لە نوسین‌و ئاخاوتن‌دا بە گۆڕین وەیا زیادوکەم کردنی× پیتێك لەوشە وەیا رستەدا واتا بەتەواوێ دەگۆڕێ وەك ( کەچ ، کەچە ـ مشت ، مشتە ـ نوسین ، نوسیم ـ هتاد ) . لە زمانی عەرەبێ دا ئەو پیتانەی کە دەخرێنە قالبی وشەوە وەیا لیێ دەقرتین بۆ پەیدا کردنی واتای تازەو جۆر جۆر لە هەمان وشە ( أنسیتموها ) پێك دێنن . بە زیاد کردنی یەکێك یا زیاتر لەو پیتانەو هاتنیان بۆ ناو وشە لە عەرەبێ دا ئەوەندە وشەی تازە پەیدا دەبن نایێنە ئەژمار وەك ( کتب ، کاتب ، کاتبوا ، اکتتاب ، استکتب ، مکاتبة ،

مَكتب ، مَكتبـــة ، مُكتوب ، اكتبوا ، يَكتبـون ، كُتابـــة ..
تـا به دواى گەوتن ليێ نابێتەوە ) . لە كورديش دا كۆمەلێك پيت
هەن دێنە ناو وشەوە بۆ پەيدا كردنى واتاى تازە . هەر چەند ئەو
پيتانە تا ئێستا كەس نەى ژماردوون وەك هى عەرەبى ، بەلام سرنجێكى
سەرپێيى دەرى دەخا ژمارەيان لەو نۆيەى ( أنسيتموها ) ى عەرەبى
يەكجـــار زياترە . وا دەبێ يـەك پيت ، واش دەبێ لە يەكێـــك
زياتر پێكەوە دێنە ناو وشەوە ومانای دەگۆڕن وەيا ليێ زيادو كەم
دەكەن . بـۆ مەبەسی روون كردنەوە چەنـــد ميسالێك دێنمـەوە :
( كوشتن . كوشتى . كوشتمان . كوشتوەتى . كوشتيان . كوشتتان.
كوشتنەوە . دەكوژێ . بكوژ . بكوژە ) لەم وشانە دا پيتى ( ن ،
ى ، م ، ا ، ە ، و ، د ، ب ) هاتنە استعمالەوە وبەشدار
بوون لە پێك هێنانی واتاى تازە دا ، سەر ژماريشيان ٨ بو . ( پول .
پولەكێ . بێ پول . بە پول . پولدار . پول بە پول ) يـاخـود
( نوسێن . پێ نوس . نوسەر . نوسراو ) ياخـود ( كردن .
هەلكردن . لێكردن . داكردن . راكردن . پێكردن . كردنەوە ) بۆ
خۆت پيتى تازە هاتو بۆ ناو وشەكان بژمێرە وخەريكى ميسالى ديكە
بە تـا دەگەى بە سەرژمارى هەموو ئەو پيتانە لەكوردى دا دێنە نـاو
وشەوەو دەبن بە هۆی دارشتنی ( اشتقاق ) وشەى تازە .

لەم گوتارە دا نوسێنەكەمان تەرخان كراوە بۆ باسى رولّى ( ى )
لە رێزمانى كوردى دا چ بە تەنيا چ لەگەل پيتى ديكە دا بێتە ناو
وشەوە و بەشدار بێ لە دەربڕينى واتا يا لە داهێنانى واتاى تازە دا .
دەبێ پێشەكى ئەوەندە بلێم ئەم باسە تا ئێستا ، وەك گەلى باســـى

دنێکە ، لە سەرێ نەنوسراوە یاخود من نەمدیوە کەس لە سەرێ نوسیبێ . کارێکی مـن لێرەدا دەیکەم سەرەتای لێکوانینەوەیێکە قولایی و پانایی تەواوێ هەیەو گەیشتن بەوپەڕی باسەکە پێویستی بە سرنجدانێکی دوورو درێژو بەراوردییێکی فیلولوجی پسپۆڕانەی فراوان هەیە . رەنگە بۆ دۆزینەوەی تعلیلی هەندێ جۆر لە بەکارهێنانی (ی) لە کوردێ دا نوسەر ناچار بێ بگەڕێتەوە بۆ سەر دەمێکی کۆنی زمانەکە لەوە بتوژێتەوە داخوا ئەو پیتە لەو زمانانە دا کە کاریان کردۆتە سەر زمانی کوردێ وەزعی چۆن بوەو چێ بەسەر هاتوە بەلکو لەم رێگەیەوە بگا بە سەرچاوەی پەیدا بونی یەك لە جۆرەکانی بەکار هێنانی ئێستاکەی . ئەم دوورو قولیە لە پەراوێزی باسەکەی مـن بەدەرە . ئەوەی لێرە دا دەیخەمە بەر چاوی خوینەر بە کار هێنانی (ی) ە لە زمانی قسە پـێ کردنی ئەورۆمان دا . هەلبەت روون کردنەوەی چەندو چۆنی ئێستاکەی زمانەکەمان رێگەی عەودل بونی سەردوژوی میژویی کوێر ناکاتەوەو ماوەش لە کەس نابڕێ بۆ هەول دانی تەواو : رەنگە پێچەوانەی ئەمە راست بێ بەو مانایە کە هەلکردنی مۆمێك هەرچەندە کزیش بێ کەم و زوز تیشکێك دەپژێنێ بەدەورو بەری خۆی دا . گەرچی کەمو کوڕێ و هەلەش هەبێ وەهەیە لە نوسینەکەم دا بەوەندە دل خۆش دەبم کە سرنجی زمانەوانی کوردو کوردیم راکیشا بێ بۆ ئەم باسەو بەمەدا لایەنێکی مەینەو شرایەوەی زمانەکەم خستبێتە بەرچاوێ .

با ئەوەندەش بلێم لێرە دا پیتی (ی) هەموو جۆرەکانی دەگرێتەوە چونکە لە راستی دا دەمو هەر (ی) ن هەر

چەند لە لاتێنی بۆ هەر جۆرە (ی) ە وێنەیێک دانراوە. سروشتی (ی ، و) ئەو جۆر جۆریە هەڵدەگرێ تەنانەت لەم رووەوە هەردوکیان خۆ لە پیتی (ا) یش جیاواز دەکەنەوە کە ئەمیش وەک ئەوان پیتەبزوێنە و لە عەرەبی دا بە هەرسێکان دەگوترێ ( حروف العلة ) . وەک لە پیتی (ی ، و) قوچاو و کرایەوە هەیە لە پیتی (ا) دا ئەم دوَ چەشنیە نادیترێ و امکانی دیتنیشی نیە . دەڵێی (پەنیر ، هەولێر - رۆژ ، روَمەت) بەلام بۆ (ا) هەر ئەودەنگە هەیە کە لە وشەی ( مانگ ) دەبیسترێ . باسی سروشتی (ی ، و)و جۆرە کانیانو ( یەک بوون ) ی هەموَ جۆرەکانیانو ئەو دەمەتەقەی لەسەر ئەو باسەوە هەڵدەستی لێرەدا جێگەی نابێتەودو دەبێ وەک سەرەباسێکی ( فونەتیك ) قسەی لێ بکرێ . بە ئاواتەوەم زمانەوانێکی کورد لەم باسە پڕ لەززەتە بدوێو تا دوا دڵۆپ ، مەوزوَعەکە هەڵگوشێ

پیتی (ی) سروشتێکی نەرمو شلی هەیە لەسەر زمان سوَک دێ. ئەم نەرمو شلیە وای کردوە پیتی (ی) بە ئاسانی بێتە ناو وشەو بە ئاسانی بسروێو بچێتەوە . وەک لێرە بە دواوە روَنی دەکەمەوە ، کورد ئەم لایەنەی بە سەلێقە هەست پێ کردوە و بە جۆرێك لەگەلی دا رەفتاری کردوە هەر دەڵێی بە (صراحە) تێی‌دەگەینێو پێمان‌دەڵێ مامڵەتم لەگەل پیتی (ی) دا مامڵەتێکی تایبەتی‌یە ، نەکەن لێی بە سیەهوَ بچن .

بۆ خاتری ئەم تێبینیەم لە ناو زنجیرەی باسەکەدا ون نەبێو

رخی نەدۆزێنێ ، لێرە دا لە سەرێ دەڕۆم تا لایی دەبمەوە ئەوجا دەگوێزمەوە بۆ ئالقەیێکی دیکە لە زنجیرەکە دا .

گوتم پیتی ( ی ) نەرمو شـلە بە ئاسـانی دێتو دەچێتەوە . هاتنی بۆ ناو وشەو رستە مەوزوعی ئەسلی نوسینەکەمە تا کۆتایی باسەکە دەیخوێنیتەوە بەلام سوانو ئیچونـی ئێسـتاکە بە جۆرێکی سەربەخۆ لایی دەکۆلینەوە .

دەزانین زمانی کوردی بۆ وەسفو ئیزافەو شەخسی سـێیەم لە فرمانی مازی تێپەر دا ( فعل ماض متعد للمفرد الغائب ) پیتی ( ی ) بە کار دێنێ وە دەلێـی ( بەردی رەق — کراسی بارام — کردیو چاندی ) . لێرەدا وشەکان کۆتاییان هاتوە بە پیتی دەنگدار [ کـراس ، بەرد ، کردن ، چاندن ] . دەوجا بابزانین کە وشـەی « موصوف یاخـود مضـاف » یا فیعلی تێپەڕ کوتاییەکەی پیتە بزوێنی ( ێ ) بـوو پیتە بزوێنی ( ی ) ی ئیزافەو وەسفو شـەخسی سێیەمی بە دوا دا هـات کورد چـی کردوە !

لە وشەی ( ڕوزی و ماسـیو دزین ) پیتە بزوێنی ( ێ ) کۆتایی یە با ئێمە وەسف بۆ ( ڕۆزی ) وئیزافە بۆ ماسـی بێنینو دزینیش بخەینە پاڵ شەخسی سێیەم لە مازی دا .

دەلێین ( ڕوزی ناسك ، ماسی زەلم ، بارام دزی ) . پێویست نیە من بلێم ، ئاشکرایە کەوا لە قسەکردن دا « ی » وەسفو ئیزافەو شەخسی سێیەم بە هیچ جۆرێك دەرناکەوێو درێـژایی ( ی ) کەی کوتایی وشەکە زیادو کەم ناکا . چ بلێـی ( ڕۆزی خۆشە ) چ بلێی

( ترۆزتی ناسـك ) فەرقێك بە ( ی ) کەی نـاکەی و لەهـەر دوَ حاڵیش دا درێژتی دەکەیەوە ، خۆ مەعلومێشە رستەی ( ترۆزتی خۆشە ) پێتە بزوێنی ( ی ) ی ئیزافەو وەسفتی تێدا نیە تابگوترێ بۆیە بە قەدەر ( تروزتی ناسـك ) درێژ بۆتەوە . واقیع ئەوەیە ( ی ) کەی ئیزافـە و وەسف لە قسەکردن دا کەم‌و زۆر خۆ بە دەر ناخەن‌و بە تەواوتی لەناو دەچن . لێرەدا چاو لەوە بپۆشە من هەر میسـالی وەسـف دێنمەوە و دەڵێم ( ترۆزتی ناسك ) چونکە فەرقی ئەم‌و ( ترۆزتی هەولێر ) نیە حوکمی هەر دوَیان یەکێکە . بۆ شـەخسی سـێیەمیش چ بڵێی ( بارام نوسی ) چ بڵێی ( بارام کردی ) لە هەردوَ حال دا درێژایتی ( ی ) کە لە کۆتایتی هەر دوَ فرماندا بە قەدەر یەکن . دیاریشە وشەی ( کردی ) کە لە چاوگی ( کردن ) ەوە هاتوە بە ئەسل ( ی ) لە کۆتایی دا نیە تا بڵێین بۆیە ئەویش وەك وشەی ( نوسی ) درێژ بۆتەوە . بەڵێ گومان لە وەدا نیە کورد بڕیاری داوە کە ( ی ) شەخسی سێیەم‌و ئیزافەو وەسـف کەوتـە دوای پـێتە بزوێنی ( تی ) وە دەبێ بقرتێ . بەلام زوربەی نوسەرانی کورد ئەم ( ی ) ە قرتاوە ئیعـدام کراوە زینـدوَ دەکەنەوەو دەینوسـن ، بەلـگەشیان ئەمەیە گـۆیا بە پێی رێزمان دەبێ ( ی ) هەبێ ئیـتر ئەگەر لە قسەکردنیش دا خۆ بەدەر نەخا لە نوسین دا دەبێ بگەڕێتەوە نەکا دەستوری زمانە کە تێك چێ . جارێ لە پێشـەوە با ئەوە بڵـێم ئێمە کە زانیمان بە ئەسل ( ی ) هەیەو ئەم راستیەمان خسـتە ناو کـتێبەکانی دەستوری زمانەوە لزوم نامێنێ ترسی تێك‌چونی دەسـتور وەیا توهمەی نەزانین هانمان بدا لەو ناوەدا ( ی ) یەك قوت‌کەینەوە . ئەگەر ئەو ترسە یەخە گیرمان بێ‌و بهانە کا بە دڵی خۆی دەبێ لە قسە

کردنیشدا جارێکی ئەو ترسە بدۆزینەوە ، خۆ ئیمە بە ئاخاوتن صەد ئەوەندەی نووسـین زمانەکەمان بەکاردێنین فایدەی چیی ئەم (ی) یە نازدارە جارێکیان بە نووسین زیندو کەینەوەو صەد جاران لەئاخاوتندا بیمرێنین . دوور نابینم رۆژەك لە رۆژان پێشنیارێك بلێی کە لە قسەکردندا گەیشتیتە (ی) ی قرتاو بڕۆیەکت هەلتەکێنە تا ببێتـە نیشانەی هەبوونی . . . وەنیە من بڕوای بڕوای دانانی نیشانە لە جێی پێویست لە نووسیندا پەسند نەکەم ، بەلام نابێ ئەوکارە بێلزوم بێ . خۆ بەنیسبەت ئەم (ی) یە قرتاوە ئیشارەت دانان نەك هەر بێلزومە بەلکو دژی ئیرادەی خاوەنی زمانەکەیە کە میللەتی کوردە ، چونکە ئیرادەی کورد ئەوەیە کە لە ئاخاوتندا (ی) دەرنەکەوت ناشێ بە هیچ جۆرێك دەرکەوێ یاخود با بلێم دەرنەکەوتن (ی) لە ئاخاوتندا بەگوێرەی ئیرادەو بڕیاری ئاشکرای گەلی کورد مانای ئیعدام کردنی دەبەخشێ . بەلگەش بۆ ئیسپات کردنی ئەم بڕیارە کەم نیە .

یەکەم : دەزانین لە کوردیدا جۆرێك لە جۆرەکانی دارشتنی ئیسمی مەعنا (Abstruct) لە ئیسـمی مادەوە زیادکردنی پیتە بزوێنی (ی) تیژە لە کۆتایی وشە . دەلێی (چاك ، چاکی ـ خۆش ، خوشی ـ سەوز ، سەوزی) . دەبا بزانین کە کۆتایی وشـەکە پیتە بزوێنی (ی) ی تیژ بۆ (وەك سپی ، برسی) ئاخۆ بۆ دارشتنی ئیسمی مەعنا چیدەکەین ؟

بەپێی قاعیدەی ئیزافەو وەسـفو شەخسی سێیەم کە لێرە بەپێشەوە لیێ دواین دەبوا لە دارشتنی ئیسمی مەعناشدا وشەکە وەك

خۆی بمێنێتەوە ، ئەو ( ی )یە کە بۆ ئیسمی مەعنا زیاد دەکرێ لە قسە کردندا خۆ بەدەرنەخاو تێ‌بچێ ؛ کەچی خاوەنی زمانەکە لێرەدا بڕیارێکی زۆر جیاوازی داوە کەمو زور لەگەل دەستوری ئیزافەو وەسفو شەخسی سێیەم پەیوەندی نیە : چونکە مەبەستی ئەوە نەبوە ( ی )کە بفەوتێ ( صیغە ) یێکی تایبەتی داناوە بۆئەوە هەم ئیسمی مەعناکە دروست بێ‌و هەم ( ی )کە بپارێزرێ . فەرمو سەیری ئەم میسالانە بکە :

دەڵێ ( زەرد ، زەردی - شین ، شینتی - سەوز ، سەوزتی ) بەلام لەگەل ( سپی ) دا کارێکی دیکە دەکەی‌و دەڵێ ( سپی ، سپیەتی ).
خۆ بە پێی زاهیری دەستوری ( نوسی‌و تروزتی ناسك ) دەبوا لیرەشدا هەر بڵێ ( سپی )و پێیەکەی ئیسمی مەعنا ئیعدام کەی .

دەڵێ ( تێر ، تێری ) کەچی دەڵێ ( برسی ، برسیەتی - هەندێکیش دەنوسن برسی‌یەتی ) . دەبوا وشەی برسێش لە ئیسمی مەعنادا هەروەك خۆی بمێنتەوەو یێیە تازەکە تێ‌بچێ .

دەبینی لەوحالانەدا خاوەنی زمانەکە رێی نەهێشتنی ( ی )کەی نەداوە خۆ ئەگەر بەرژەوەندی دیتبا یا ئارەزوی کردبا کەس مەنعی نەدەکرد لە ئیعدام کردنی ، ئەوسا منو تۆش بۆ خۆمان لە نوسینوا وەستاییمان بەخەرج دەبردو ( ی )یەکمان قوت دەکردەوە وەك کێلی قەبرو دەمان نوسی ( برسی ، سپی ) .

دوەم : لە حاڵی نیسبەتیشدا وەك مەعلومە یێتە بزوێنی ( ی )ی تێ ژ دەخرێتە کۆتایی وشەوە وەك ( شارەزوری ، هەولێری ،

ەجەفتی ) . ئەوەندە هەیە ئەگەر کۆتایی وشەکە بزوێنی (ا ، وَ ، ۆ . ێ ، ە ) بۆ لەبەر ناچاری ( ی ) یەکی دەنگدار (Consonant) دەخرێتە میانی ئەو پیتانەو « ی »ی نیسبەتەوە تا ئیمکان هەبێ تلفظ بکرێ چونکە پیتە بزوێن هەلناگرێ پیتە بزوێنێکی دیکەی بچێتە سەر . دەڵێی ( خورما ـ خورمایی ، بانە ـ بانەیی ، شنۆ ـ شنۆیی ، لادێ ـ لادێیی ، مازوَ ـ مازوَیی ) . ئەدی ئەگەر کۆتایی وشەکە پیتە بزوێنی « ی »ی تیژ بۆ [ ئەو پیتە بەپێی بڕیاری کۆڕی زانیار « ی » دەنوسرێ ، زوربەی نوسەران بە دوَ « ی »ی دەنوسن : هەیشە ئیشارەیێکی دیکەی بۆ دادەنێ ] ئەوسا دەبێ نیسبەت بو ئەو وشەیە چۆن بێ ؟ بەپێی قاعیدەی باس لێکراوی ایزفەو هاوڕێکانی دەبوا « ی »کەی نیسبەت خۆ بەدەرنەخاو وشەکە وەك خـوێ بمێنێتەوە . کەچی کوردەواری وای نەکردوە ، هەرچەند هەمو کورد لە یەك ڕێبازەوە نەڕۆیشتون بو دەربڕینی نیسبەت لەمحالەدا بەلام هەمو لەوە اتفاقیان کردوە کە نابێ « ی »ی نیسبەت ئیعدام بکرێ . ناوچەی کۆیە بۆ دارشتنی صیغەی نیسبەت لە وشەی وەك « جەلی و سماقولی و سلێمانی » دەڵێ « جەلیەتی ، سماقولیەتی ، سلێمانیەتی » واش دەبێ دەڵێ « جەلەتی ، سماقولەتی ، سلێمانەتی » هەندێ ناوچە لەو حالانەدا ئەم صیغەیە بەکارناهێنێ « ی »کەی نیسبەتیش ئیعدام ناکا دەڵێ (خەلقی سلێمانی و جەلی . . ) ١٠ ڕۆژ بێش نوسینی ئەم جێگایە لە کۆیە بوم و قەلەبالغی هەبو بەدەورمەوە ، یەکێك لە قسانذا گوتی « کابرایەکی جەلیەتی فەردە توتنێکی دەفرۆشت » . ئەمە بۆیە دەگێڕمەوە چونکە لە هەندێ

زمانەوانی خەلقی ناوچەی سلێمانیتم بیستوە ئەم صیغەیان بەرگوێ نەکەوتوە کەچێ لە دەوروبەری کۆیە زۆر باوە.

سێیەم : وادەبێ واوی بزوێن (ئەوەی هەندێ نوسەر بە دۆ « وو »ی دەنوسن ، کۆڕی زنیاریش ئیشارەی دەخاتەسەر « وَ » ) وەك «تۆ»ی بزوێن دەکەوێتە کۆتایی وشەوە وەك (دۆ ، پشتۆ ، خۆ) . بەپێی قیاس دەبوا ئەگەر واوی عطفی بەدوادا هاتبا واوەکەی عطف تێ‌چۆباو خۆی بەدەرنەخستبا هەروەك دیتمان « تۆ » بەدوا پیتە بزوێنی « تۆ » دا لەنەودەچێ . بەلام کورد واوی عطفی نەفۆتاندوە با بە دوا وشەیێکیشدا بێ کە کۆتایی پیتە بزوێنی واوی تێژ بێ . کە دەڵێی (دۆ و سێ) خۆخەریك دەکەی واوەکە بە ئاشکرایی‌و بێ گومان بدرکێنی هەرچەنددەربزێنی واوەکە سەهاتێش نیە . بۆئەوە واوەکە بە باشی ببیسترێ بەدوا واوی کۆتایی وشەکەدا ، دەی‌بزوێنی‌و « ضمە » یێکی سوك دەدەیتێ نەکا لە پەنا پیتە بزوێنی پێش خۆیدا نموودی نەبێ . تۆ کە دەڵێی « کوردو عەرەب » واوەکەی عطف لێرەدا واوی بزوێنە چونکە بە دوا پیتی « د »دا ترسی لەناو چونی نیە بەلام کە دەڵێی « دۆ و سێ ، رۆ و دەست » لەراستیدا واوەکەی عطف دەکەی بە دەنگدارو وارێکی بزوێنی کورتی بەدوادا دێنی تا واوەکەی عطف لە ژێر تاوی واوەکەی کۆتایی وشەی پێشەوە نەشێتەوە ، تەنانەت بەپێی دەستوری نوسین دەبێ « رۆ وو دەست ، دۆ وو سێ » بنوسرێ . ئەمە جارێکی دیکەش ئیرادەی کورد دەردەخا لە

چونیەتی ماملەتی لەگەل وشەو پیتو قسەکردن : بەلای کوردەوە وَ وی عطف ئەوەندە گرینگەو سەربەخۆیە ناشێ بسوێ‌و لەناوبچێ . وەك « ی »ی ایزافەو وەسفو شەخسی سێیەم نیە سوانی زەرەر ەبەخشێ . تۆ کە گوتت ( رۆ دەست ، دوَ سێ ) واتاکەت کورت دێنی‌و مەبەست رۆن نابێتەوە . هەندێ جار سوانی واوی (عطف) و ون بوَنی لە میانی دوَ وشە دا وشەی تێك دراو پێكدێنێ یاخود واتایێکی ئەوتۆ دەبەخشێ پەیوەندی نەبێ لەگەڵ (عطف) . کە بڵێی (دوَسێ) وەك ئەوەیە گوتبێتت دوَجار سێ کە دەکا شەش ، بۆیە ناچاری کە مەبەست لە ( دوَ سێ ) ٢+٣ بێ دەبێ بە ئاشکرایی واوەکەی میانی وشەی ( دوَ )و وشەی ( سێ ) بدرکێنی‌و بڵێی ( دوَ وو سێ ) تابکەن پێنج . دەوجا کە قرتانی واوێك ئەوەندە ئیشکال دروست بکا دیارە نابێ بقرتێ . کورد ئەوەی هەست پێ کردوە بە جۆرێکی سەلیقەیی وبێ مامۆستا ، رێزمانی وتوولێژیشی بەپێی ئەو هەستو سەلیقەیە داڕشتوە : حەیفو صەدحەیف ئێمە دروشمی زەکاو ئیدراکی فیتری ئەو گەلە بسڕینەوە بە خۆتێ‌هەلقوتاندنی دوَر لە شارەزایی هەرچەند لە روالەت دا هەلقوتانەکەمان بە کارێکی ئوستادانەش بێتە پێش چاوان .

قە لەوەندە نابڕێتەوە : سەر رای ئەوە ژیاندنەوەی « ی » ی مردوَ لە نوَسین دا کارێکە دوَر لە شارەزایی‌و پڕە لە ستەم دژی زەکای کوردەواری ، ئا ئەم ژیاندنەوە بەرەنگاری فرمانێکی بێ سەرو بنمانی دەکاو ئەرکێکمان دێنێتە بەر لیێ دەر نەچین ، چونکە لە

کوردیی دا وەنیە هەر « ی » لەو شوێنانە دا سوابێ بەلکو پیتی قرتاو لــە زمــانەکەمان دا ئەوەنــدە زۆرەو جێگــاکانی ئەوەنــدە جۆر جۆرە ئەگەر وەك « ی » هەمتویان بژیێنەوە زمانەکە تیك دەچێ‌و لە « کوردیی » دەشۆرێ . رێی ئەوەشــت نیە بڵێی هەر « ی » دەژیێنمەوە مەگەر خۆتم لێ بکەی بە حاکمی عورفی چونکە فەرقـی « ی » نیە لەگەل پیتی دیکە دا کە ئەمیانت ژیاندەوە دەبێ هەرچیی وەك ئەو مــردوو بن بیانژیێنیتەوە : قیامەت هــەر لە بەرخـی مەلا دانەهاتوە . دەبێ لە نووسین دا ( بەرەڵڵا ) بگەرێنیەوە بــۆ « بەرهەلدراو » ، « هەستە » بکەیتەوە « هەل بوەستە » . . . کاوج ، کل وجە ... نەخوازەلا ، نەخوازێ ئەڵڵا یا هەر بنجێکی دیــکە بــێ ... مریشك ، مری هێشك ... مراوی ، مری ئاوی ... گـۆرانی یاریکە راکە پێکەنە دەبێتە یاریی بکە را بکە پێ بکەنە . دەبێ سالەها خەریك بی ئەسلو فەسلو بنجو رەگی هەمو وشەیێك لە کوردیی دا بدۆزیەوەو وای بنووسی . کە ئەمەت کرد زمانی کوردیت کوشت ، کە ئەمەش نەکەی نابێ تەنها یەخەی « ی » بگری و دەستە ملانی بی .

لە کوردیی دا قرتاندن ( حذف ) دەستوورێکی زۆر پەرە سەندوەو رێزمانیشە ، ئەوەندە هەیە نابێ قرتـاندن ترتیبی پیتی وشـە بگۆرێ چونــکە کە ترتیبی گۆرا وشەکە دەبێتە نارەوان . بۆمیسال : وشـەی « دشنام ـ دژنێو » لە رێی قرتاندن بوە بە « جنێو ، جوێن ، جوێن ، جون » . گۆرینی « دژنێو » بۆ « جنێو » سـەلیقەی راســت پەسندی دەکا چونکەدوو پیتی « دژ » بە کورت کـراوەیی گـۆراون بۆ « ج » کە لە درکاندن دا نزیکە لە « دژ » . دیارە تاکە پیتی « ج » لە سـەر زمان

سوکتره له « دژ » . کهواته لهو گۆڕینو کورت کردنهوه دا سوود بەرهەم هاتوه بێ ئەوه ترتیبی بێتەکان تێك چێ . ئیتر لەوه زیاتر چێمان دەوێ کە لە ڕێبازێکی هەموارەوه زمانەکەمان ئاسانتر کەین .
بەلام گۆڕینی « جنێو » بو « جوێن » ترتیبی بێتەکان تێك دەدا بۆیە بە « رەوان ـ فصیح » لە قەلەم نادرێ کەواتە دەبێ توسەر خۆی لێ بپارێزێ . کە « جوێن » نازەوان بۆ جۆن هەر بەجارێ لە رەوانیی دەشورێ . بەلێ خەلق لە قسە کردن دا هەموان دەڵێنو کەسیش رێی ئەوەی نیه منعیان بکا بەلام ئەوەی غەلەتە هەر غەڵەتە ، لە کوردیدا بێ یا هەر زمانێکی دیکەی جیهان بێ ، خۆ ناشکرێو ناشێ غەڵەت بە راست حیساب بکرێ .

میسالێکی دیکەت بۆ دێنماوە : دەگوترێ ( لە بۆچی هات ؟ ). ئەمە کورت کراوەتەوەو بوە بە ( بۆچی هات ؟ ) . جارێکی دیکەش کورت کراوەتەوە بۆتە ( بۆ هات ؟ ) . ئەم سێ رستەیە تائێستا لە قسەکردندا زیندوون . بە لای منەوە هەر سێ رستە دروستن چونکە لە کورت کردنەوە بەولاوە شتێك نەهاتۆتە ناوەوە لە راستییان دوور خاتەوەو بیانکا بە هەلە : کورت کردنەوەش لە کوردیدا دەستورە ، هەر مامەلەتێکیش بەر دەستور کەوت پەسندە .

بەلام گۆڕینو کورت کردنەوەی ( لە بۆچی هات ) تا دەبێتە ( لۆچی هات یاخود لۆ هات ) لە دەستور لای داوە چونکە دیارە وشەی ( لۆ ) لە ئەسلدا موجود نیەو پێك‌هێزاوە لە لامەکەی ( لە )و واوەکەی ( بۆ ) . واتە ( لە بۆ ) کراوەتە ( لۆ ) . ئەم

داڕشتنە بەر هێچ دەستوورێك ناكەوێ تا بڵێین داڕشتێكی راستە . ئەگەر لە كوردیدا ( لە لۆچێتی ) هەبا ئەوسا دەمانگوت ( لۆچێتی ، لۆ ) كورت كراوەن دەبوون بە ( فصیح ـ رەوان ) چونكە گوتمان كورت كردنەوەی دەستووری ( رەوانی ) تێك نادا . نووسەرو پشكنەرو لێكۆڵەرەوە رێی ئەوەی هەیە وەك زانای ئەكادیمێی پنجو بناوانی گوتەو رشتەو دەستووراتی زمانەكە هەڵتەكێنێ بیانباتەوە سەر رەگو بنكەو بناخەی ئاسلییان ، لەو رێبازەشدا تا بەرەو مێژووی كۆن هەڵكشێو لە سرنجو تێفكرینو بەراوردی كردنی قووڵ بێتەوە زیاتر خزمەتی زمانەكەی دەكاو هەوڵو تەقەللاكەی بەرهەمدارتر دەبێ . بەلام رێی ئەوەی نیە دۆزینەوەی ئەسلی وشەیێك بكا بە هۆی ئیعدام كردنی وشەیێكی دیكە كە لەرێی گۆڕانو كورت كردنەوەدا شكلێكی تازەی پەیدا كردوە . زانایێكی گۆڕانی گیان لەبەران با ئەسلی ژیان بدۆزێتەوەو بە پێپلكەی گۆڕاندا سەرەو ژێرو سەرەوژوور بڕوا تامرۆڤ دەگەیەنێ بە گیانلەبەری ( یەك خلیە ) ، بەلام تۆ بڵێی بۆی هەبێ بڕیاری ئیعدامی مرۆڤ بدا چونكە ئەسلەكەی دۆزیوەتەوە ؟ یاخود لەناو جەوانی هەموو كەسێك بنووسێ ئەمە لە ئەسلدا ( یەك خلیەیی ) بوە نەكا ئەو راستیە فەرامۆش بكرێ ؟ بەس نیە زانیارەكەو راستیەكە تۆمار بكاو بیانپارێزێ لە فەوتان بێ ئەوە خۆیو خەلق دوچاری ئەركی بێ لزوم بكا ؟ .

زمان چونكە كەرستەی تعبیری گیانلەبەرێكی قابلی گۆڕانە ئەویش لە گۆڕان دایە . ئەگەر بەرادەی گۆڕانی ژیانو یاسای كۆمەلایەتیو بەرهەمی زانستی ئادەمیزاد زمانەكەی نەگۆڕێو پێش نەكەوێ دیارە وردە

وردە گز دەبێ تا بە جارێ دەکوژێتەوە . دەبێ فرمانی زمانەوان ئەوەبێ
زمەتی زمانەکەی بدا تا دەسەلاتی تعبیری زیاد کاو شیایتی ژیان و
گەشەکردنی بکا بە پلەی سەرسوڕێنی زانست و تەکنیکی نوێ .
زمەتی دانیش لەوەدا یە زمان بخرێتە قالبی مردوو و رێگەی
ئسان بوون و مشتومال کردنی لێ بگیرێ . بە رادەی ئەوە کە
گێڕانەوەی ژیان بۆ سەدەی چواردەهەم و پازدەهەم دەیکوژێ و
ەناوی دەبا گێڕا نەوەی زمانیش بۆ رابردوی کۆنی یەکی مانەوەو
گەشەکردنی دەخا . سەرڕای هەمۆ ئەو تێبینیانەو گەلێکی دیکەی
کە هەن و نەمهێنانە ناو باسەکەوە شتێکی زور گرینگ هەیە دەبی
رەچاوی بکەین : کە بڕیارمان دا ئەو پیتانەی لە قسەکردندا سواون
لە نوسیندا بگەڕێنەوە ئیتر نوسەری عادەتی کوردی لەبازاڕو دەرو
دەشت بۆ خۆی دەست و قەلەمی رەق دەبێ چونکە معلومە نوسەری
عادەتی ئەو دەستورو ریزمانە نازانێ فێری ئەوەی بکا لەکوێ پیت
فرتاوە تا لە نوسیندا بیگێڕێتەوە . زانینی ئەم لایەنە نەك هەر بۆ
پیاوی عادەتی بەلکو بەنیسبەت خوێندەواری فراژوشەوە زەحمەتە .
فەرمو لەگەل مندا سرنجێك بدە ئەم زەحمەتیە :

- شەخسی سێیەمی تاك لە فیعلی مازی تێ نەپەڕدا ڕاناوەکەی دەرنا کەوێ
وەك لە تێپەڕدا دەردەکەوێ . دەڵێی « رۆیشت ، خەوت ، نوست ،
هەلستا ، مرد ، ژیا ، چو ، هات » لەمانەو هەمو فیعلیکی تی نەپەڕی
وەك ئەمانە « ی »ی شەخسی سێیەم وجودی نیە . کەواتە ئەوانەی
کە لە فیعلی تیپەڕی وەك « نوسین ، دڕین ، پرسین ، کرین ،
دزین » بو شەخسی سێیەم « ی » یەك بەزیادەوە دەنسن « پرستی ی ،

کڕتی ، دزتی » دەبێ ئاگاداری ئـەوە بـن لە مازی تێنەپـەڕی شەخسی سێیەم کە بە ئەسل فیعلەکە « تی »ی تێدابێ نابێ « ی »یەکی دیکەی لێ زیاد کەن . « فڕتین ، خزتین ، خشتین ، ڕزتین » و هەمو فیعلێکی تێنەپەڕی وەك ئەوان کە خرایە پال شەخسی سـێیەم دەبێ بنوسرێ « فڕتی ، خزتی ، ڕزتی » چونکە لەوحالەدا شەخسی سێیەمی تاك ڕاناوی نیە . دەوجا سەیری توسەری عادەتی کورد بـکە چون سەری لێ ناشێوێ کە دەیەوێ بنوسێ « دزتیو فڕتیو خشتیو بڕتی » ؟ لەکوێ ئەم « ی » یە قـوت کاتەوە وەك کێلە قەبـــرو لەکوێ بیخاتە قەبرەوە وەك مردو !

ئەم زەحمەتیەت لەبیر بێو بە چاوێـکی پڕ لە وردیو ژیریەوە سەیرێکی فەلاکەتی لێرە بەدواوە بکە .

گوتمانو دیتمان ڕاناوی شەخسی سێیەمی تاك لە فیعـلی مازی تیپەڕدا « ی »یە . بەپێچەوانەی ئەو ، ڕاناوی شـەخسی دوەمی تاك لە فیعـــلی مازی تێنەپەڕدا « ی »یە یاخود « یت »ە . بو شەخسی سێیەم دەڵێ « کوشتی ، بردی ، کردی » بو شەخسی دوەم دەڵێی « بردت ، کوشتت ، کردت » بەلام بو شـــەخسی دوەم لە مازی تێنەپەڕدا دەلێی « نوستیت ، هەلستایت ، کەوتیت ، رویشتیت » هەیشە دەڵی « نوستی ، هەلستای ، کەوتی ، ڕویشتـی » بـــۆ مەبەسی کورت کردنەوە [ خوم لەوانەم ] . کەواتە بەپێی مەزهەبی دۆستانی « ی »ی قرتاو لەو فیعلە تێنەپەڕانەی کە بـە ئەسل « ی » یەهە وەك « فڕتین ، خزتین ، خشـــتین » دەبێ بـۆ شەخـــی

دوەمی تاك بنوسـێ « فڕێیت ، خزێیت » یاخود « فـــڕێی ، خزێی ، خشێی » ئەگەر ویستت بو اختصار « ت »یەکە بقرتێنێ :

بەلام لە فرمانی ( مضارع ) دا فرمانەکە تێپەڕ بێ یا تێنەپەڕ بـێ ئەو (ی)یەی شەخسی دوەم هەر دێتـە ناوەوە . دەڵـێ (دەنوی ، دەڕۆی ، هەڵدەستی ـ یاخود دەنویت ، دەڕۆیت ، هەڵدەســـتیت ) هەروەها دەڵێی (دەخۆی ، دەکەی ، دەکوژێ ـ دەخۆیت ، دەکەیت ، دەکوژیت ) لێرەشدا دەبێ ئاگـاداری ئەوە بێ فەرقی تێپەڕو تێنەپەڕ نەکەی و (ی)یەکی زیاد بخەیە کـۆتایێ ئەو فرمانانەوە کە لە ئەسـڵدا (ی)یان هەیەو بنوسیت ( دەفڕیی ، دەخشیی ، دەخزیی ، دەنوسیی ، دەدزیی ، دەدڕیی ـ یاخود دەفڕییت ، دەخشـییت ، دەدزیـیت . . هتاد ) ناشزانم چۆن دەتوانی خۆت رزگار کەی لە ئیشـکالی رێنوس داخوا دەنوسی (فڕییت ، فڕیی‌ت ، فڕییت ) .

پشتێ حەسانەوە مەدە فەلاکەتێ دیکەش لەپێشە .

بۆ « جمعی متکلم » لە فرمانی مازێ تێنەپەڕ دو پیتێ( یـــن ) بەکار دێ وەك ( نوسـتین ، رۆیشـتین ، هەڵســـتاین ) لە مازی تێپەڕ دەگوترێ (کردمان ، بردمان ) لە فرمانی مضارعیش دا ئەم (ین ) ە بۆ ( جمعی متکلم ) هەردێتەوە بەلام ئەمجاریان فرمانەکە تێنەپەڕبێ و تێپەڕ بێ فەڕق ناکا . دەڵێـی (دەڕۆین ، هەڵدەستین ، دەنوین ) هەروەهـا دەشڵێـی ( دەکەین ، دەخۆین ، دەبێنین ) . کەواتە بۆ ( جمعی متکلم ) یش وەك شەخسی تاکی دوەم لە فرمانی مازێ تێنەپەڕداو لە فرمانی «مضارع»ی تێپەڕو تێنەپەڕدا « ی »یەکی زیاد دەبێ بخەینە پاڵ « ی »ی ئەسـڵێ و

بنوسێن « ڤزێ ین ، خزێ ین ، دەڤزێ ین ، دەخزێ ین ـ دەنوسـێ ین ، دەبزێ ین » . لەئەنجامی ئـەم تێکەڵ پێکەڵێ و مەعلومات فرۆشـیەدا ئەم لیستەی سیحری خواردوە پێكدێ :

( بارام دزێ ی ) چونکە مازێ تێپەڕە بو شەخسی سێیەمی تاك .

( بارام خزێ ) چونکە مازێ تێنەپەڕە بو شەخسی سێیەمی تاك .

( جەنابت دزێت ) چونکە مازێ تێپەڕە بو شەخسی دوەمی تاك .

( جەنابت خزێت ) چونکە مازێ تێنەپەڕە . . . .

( جەنابت ددزێت ) } چونـکە فـرمانەکە ( مضـارع ) ە بو
( جەنابت دەخزێت ) } شـەخـسی دوەمی تاك .

( جەنابت دەچێت ) چونکە فرمانەکە لە ئەسلدا « ی » ی نیە .

( ئێمە خزێ ین ) چونکە مازێ تێنەپەرە بو ( جمعی متکلم )

( ئێمە ددزێ ین ) } چونـکە فرمانەکە ( مضـارع ) ە بۆ ( جمعی
( ئێمە دەخزێ ین ) } متکلم )

( ئێمە دچێن ) چونکە فرمانەکە لە ئەسلدا « ی » ی نیە .

لیستەیێکی رێكوپێك وەك ( جۆگەلەی لۆغاریتم ) ، هەر دەبـێ پیرۆز بایێ بۆ بکەی لەو نوسەرانەی حەز لە پاراسـتنی ئەو شـتانە دەکەن کە کورد کوشتوێ ...

پێی ناوی من بلێم ، لە خۆوە دیارە ، ئەم شـێوە نوسێنە لە مەتەل دەچێ و هەر دەڵێی زەکای خەلقی پێ تاقـێ دەکەیتـەوە .

ئەمەی هێنامە پێش چاوی خوێنەر لەو چەند دێڕانەی دوایی‌دا وەنیە لەبەر مەبەسی نەســەلماندن وە یا خۆ هەلدانەوە بێ ، نەخێر ئەمــە نیشانەی ئەنجامێکی ( حتمی‌یە ) راستەوخۆ هەلدەچێ لە کاسەی ئەو رێنوســەی بە کەلکی دەنوسێ ( ترۆزتی‌ی ناسك ) .

زۆر بوونی دەســـتور لە زماندا بۆ خۆی دەبێتە ئامانجێك ، هەتا قەدەر زمانەکە زەحمـــەت ، رەنگە لەویش زەحمەتتر بێ . قواعدی عەرەبی دەجار لە عەرەبی زەحمەتترە . گەورەترین نوسەرو بەرێزی عەرەب رزگـار نەبوون لە هەڵەی قەواعیدی . کەس نیە ( قواعد اللغة العربیة) بزانێ‌و هەڵەی تێ‌دا نەکا بەلام دەیان ملیۆن کەس عەرەبی دەزانن ، هەزاران خوێنەرو ئەدیبیش هەن پوختەییێکی باشی قەواعید دەزانن کە کافی بێ بۆ نوسینو تێگەیاندن . با ئێمە پەند لەوە وەرگرینو لەرێی مەعلومات فرۆشتی‌و بە ناوی پاراستنی زمان ، نوســینو رێنوسو رێزمان لە خەلقی وەزەحمەت نەیەخین . تا دەتوانین بەردو ( ئاسانترو سادەتر ) دەوە بڕۆین بە مەرجێك نەچینە ناو سنوری هەلە

بە دەم نوسینەوەو لەرێی میسال هینانەوە ناوی ( ی ) ئیسمی مەعنام هێنا . مەوزوعی ( اسم المعنى ـ Abstruct noun ) درێــژەو تفصیلێکی زۆری هــەیە ، لێرەدا لە گۆشــەی نیگای پێتی ( ی ) و بەشداربونی لە پێكهێنانی ســـینەی ( ئیسمی مەعنا ) لە کوردی‌دا سەیری مەوزوع دەکەینو بەس .

وەك دیار دەکەوێ لە باسەکەمان ، کورد بە سەلیقەوە لە داڕشتنی ئیسمی مەعنادا دەستوری وای بەکارهێناوە ئەویش وەك هەنـدی لەو

دەستوورانەی باسمان کردن هەر دەڵێی کاری پسپۆڕو دەسکردی شارەزایانە نەك بەرهەمی عفویو تێکڕای میللەتێکە.

ئەو وشانەی پێیاندەگوترێ ناوی مادە (اسم المادة) بەگوێری رادەی مادیەتیان دەکرێن بە سێ بەشی لەیەکدی جودا [من ئەو سێ بەشە پەسندتر دەکەم لەوە بکرێ بە پێنجو شەش].

بەشی یەکەم: ناوی مادی تەواو. وەك: (بەرد، خەلوز، چیا، ئاو، برنج...)

بەشی دوەم: ناوێکە لە خودی خۆیدا مادە نیە بەلام دەبێ بە ناو یاخود نیشانەو عەلامەت بۆ شتێك یا گیانلەبەرێك یا بۆ مرۆڤ کە هەمتویان مادەن وەك: (قوتابی، قایمقام، کارگێڕ، فەللاح، پێشەنگ،) وگەلێك لە ناوی وەزیفەو کەسبوکار. وەك دەبینی ئەم بەشەی دوەمی ناو، مەرج نیە ببێ بە مال بۆ ئەو شتەی یا ئەوکەسەی پێی ناو نراوە. لەوانەیە یەکێك ئەوڕۆ قوتابی بێ رۆژێکی دیکە فەللاح بێ یاخود لە هەمانکاتدا قوتابیش بێو فەللاحیش بێ. بەلام بەشەکەی یەکەم گۆڕانی تێدا نیە، بەردهەر بەردە ئاویش هەر ئاو. کە بەردت ورد کردو بوو بە گەچ لە بەردایەتی دەشۆرێ، واتە وەك ئەو کەسە نیە کە فەللاح بێو قوتابی بێ هەر هەمان کەس بێ، «شتێك» کە بەرد بوو یاخود ئاسن بوو کە بە هێزێکی فیزیایی وەیا کیمیایی کرا بە مادەیێکی دیکە حیسابێکی تازەی بۆ دەکرێ لە ژێر ناوێکی تازەدا. بەرد هەر بەردە، بەرد گەچ نیە. بەرد مادەیە قوتابیو مهندس لەخۆیانەوە مادە نین «اصطلاح»ن کراون بە ناو بۆ مادە. ئەم

مقارنەیەو لێکدانەوەی نەزەری دوَر دەکێشێ تا دەگەینە کۆتایەکەی ، بالەکورتی بتی بڕێنەوەدو بچینە سەر بەشەکەی سێیەم .

بەشی سێیەم : ئاوەل ناوە (صفـە) . لزوم نابینم لێرەدا بکەوینە سەر وەسفو ناساندنی ( تعریف ) ئاوەلناوو تا چەند دەلالەتی مادیەتی هەیەو چۆن وادەبێ بەپێی سروشتی (موصوف) یاخود لەبەر دارشتنی لەسەر چاوەێکی نامادیەوە ئاوەل ناوەکەش لە مادیەت دەشۆرێ وەك بڵێی ( خەونی خۆش ، خانوێکی ، خەیاڵتی ) چونکە خەریك بوَن بەو تفصیلاتە گەلێك دوَرمان دەخاتەوە لە ئەسلی بابەت . مەبەس شتی کردنەوەی دارشتنی ئیسمی مەعنایە لە ئاوەل ناو . تەنانەت خۆ لەوەش ناگەینم داخوا اصطـلاحی ( اسم المعنی ـ معنای مطلق ـ تجرید ـ Abstruct ) کامیان پەسندترو وراستترو گونجاوترە لەگەل واتای ئەو سیغەیە کە قسەی لێ دەکەین . لەمەکتەبی سەرەتاییەوە فێرکراین بڵێین ( اسم المعنی Abstruct noun ) و ( اسم المادة material noun ) منیش هەر ئەو دوَ زاراوەم خستۆتە استعمالەوە لەم نوسینەمدا ، لێشیان نازازی نیم چونکە بۆ هەلوەستی ئێستاکەمانو تا بڕیارێکی گشتی دەدرێ بەجۆرێکیدیکە ، خزمەتی مەبەس دەکەنو واتای ویستراو رادەگەینن .

رێی باس کردنی بەشی سێیەم ، وەك من بۆ باسەکە دەچـم و تێیگەیوم ، هەموارترو بێ کۆسپترە لە دوانەکەیدی . رچەی ئەم نوسینە دەریدەخا یەکەمو دوەم گیروگرفتو دەمەتەقەیزوزە ، رەنگە باری وای تێدا بێ سەلماندنو نەسەلماندنی نیوانیو بێ .

با لە ئاوەڵناوەوە دەست پێ بکەین .

بەجۆرێکی پێشەکێتی دەڵێـم دەمێ ئـەو ئاوەڵناوانەی بە پێتە دەنـگدارەکان کۆتاییان هاتوە وەك (جوان ، بەرز ، خـۆش ...) ئیسمی مەعنایان لێ وەردەگیرێ بە ئیزافەی (ێ) واتە پێی تـیژ لە کۆتایێ وشەکەدا ، تەنانەت ئەگەر دوَ پێتی (و ، ی) یش دەنگدار بێوزو کەوتنە کۆتایێ وشەوە ، دەستـورەکە ناگۆڕێ . دەڵێی : (جوان ، جوانـێ ـ رێـك ، رێـکێ ـ دزێو دزێوێ ـ خاو ، خاوێ ـ هێزای ، هێزایـێ ) بەلام کە کۆتایێ وشە پێتە بزوێنی (ا ، وَ ، ۆ ، ێ ، ە ) بێ وەك وشەی (ئازا ، دوَزَوَ ، دەستەمۆ ، کرمی ، روَتە ) ئەوسا پێـتە ( ی )ی دەنـگدار دەکەی بە پەیوەندی میانی ئەو پێتە بزوێنانەو پێـتە بزوێن (ێ) چونکە مەعلوَمە پێـتە بزوێن ناچێتە سەر بزوێنێکی دیـکە ، ئیـتر دەگوترێ (ئازایـێ ، دوَزَوَیێ ، دەستەمۆیـێ ، کرمێیـێ ، روَتەیـێ ) . لەبیرت بێ هاتنە ناوی ( ی )ی دەنگدار لێردا ئەویش جۆرێکە لە بەکارهێنانی ( ی ) لە رێـــزمانی کـوردیێداو بەلـگەیێکە بـۆ سەپاندنی ئەوە کە پێـتی ( ی ) لەبەر سروشتی نەرمو شلێ زوَ دێتە ناوەوە . لەو هەمـوَ پێتانەی ئەلفو بێی کوردی پێتی ( ی )مان هیناو کردمانە پەیوەندی میانی وشەکانو پێتە بزوێنی (ێ) ئیسمی مەعناو نەمانگوت (ئازاوێ ، دوَزَوشێ ، دەستەمۆلێ ، کرمۆفـێ ، روَتەکێ ) . لێرەدا ئەوەش دەلێمەوە ئەگەر کۆتایێ ئاوەڵنـاو پێـە بزویـــنی (ێ) واتـە پێی تیژ بـێ وەك (برسێ ، تەزێ ) ئیـسمە معناکە دەبێتـە ( برسیەتـێ ، تـەزیەتـێ ) . لەبەر زێدە قورسێ ناگوترێ (برسێیـێ ، تەزێیـێ ) ناشکـرێ

(ێ)کەی ئیسمی مەعنا لەناو بچێ لەبەر هۆیەکی یەکجار گرینگ کە فیترەتی هەستیاری خاوەندی زمانەکە رەچاوێ کردوە . هۆیەکەش ئەمەیە :

تۆ ئەگەر ئیسمی مەعنات داڕشت لە وشەی وەك (برسێ) بە زیادکرنی (ێ) لە کوتایێ وشەکەدا ئەوسا بەپێی قاعیدەو لەبەر زەحمەتێ دەرکاندن (تلفظ) یێکە وەك هێ شەخسی سێیەم و وەسفو ئیزافە لە گوتندا خۆ بەدەرناخاو تێدەچێ . بەوجۆرە وشەکە وەك خۆی دەمێنێتەوەو هەر دەگوترێ (برسێ) . دەوجا وشەی (برسێ) بە مانای (جایع) لەگەل (برسێ) بە مانای (جوع) تێکەل دەبن و جیاکردنەوەیان زەحمەت دەبێ هەندێ جاریش هەر جیا ناکرێنەوە . کە گوتت (برسێ ناخۆشە یاخود گوتت وەی برسێ چەند دزێ !) بۆت مەعلوم نەکرا مەبەست (جائع - برسێ) بێ یاخود (جوع - برسیەتێ) بێ . بەمەدا دیار دەکەوێ کورد سیغەیێکی تایبەتێ هێناوە بۆ ئەو تەرزە وشانە تا لە چەلەمەی تێکەل بوونی مانای جیا جیا رزگاربێ . لەقرتانو تێچوونی (ی)ی شەخسی دوەم و سێیەم و ئیزافەو وسف ترسی ئەو تێکەڵ بێکەلیە لەگۆڕێدا نیە ، تۆ کە گوتت (ترۆزێ ناسك ، ترۆزێ شارەزوَر) هەر یەك واتا دێتە مێشکی گوێگرەوە بۆیە لزوم نیە بڵێی (تروزیەتێ ناسك ، تروزیەتێ شارەزوَر) هەر بۆیەیشە لە نوسێنێشدا هێچ لزومێك نیە (ی) مردوَ بەدوا (تروزێ)دا قەتارکەی . دەربارەی ئەم مەوزوعە هەندی روشنبیری زل بولایەنگیرێ کردن لەنوسێنی (تروزێی

ناسك ) دەڵێن و خۆیشم لێم بیستوون ئەگەر ( ی )ی ئیزافە نەنوسرێ ( ئازادی ئامۆزام - ازاد ابـــن عمی ) جیاوازناکرێتەوە لە ( ئازادی گەل حـریە الشعب ) . بـۆ رەواندنـەوەی ئـــەم تەگەرەیـە وەڵامی قەناعەتبەخش هەیە :

جارێ با ئـــەوە بڵێـم تـــۆ ئـەگـەر بـــە نۆســـینیش چارێکت کرد ئەی لەقسەکردندا چ دەکەی ؟ لێرەدا قسەیێکی پێشـوم دوبارە کردەوە .. بەناچاری .

لەراستیشدا ترسی تێکەڵیو سـەرشێوانیە چـونکە ( ی )ی ئیسمی مەعنا گەلێك درێـــژترە لە ( ی ) ئیزافەو وەسف ، واتـــە ( ی )کەی ( ئازادی گەل ) فەرقێکی زوری هەیـە لەگەی ( ی )کەی ( ئازادی ئاموزام ) . من لەنوسیندا ئەم دو ( ی ) یە بەپێی دریـژیو کورتییان لەیەکدییان جیادەکەمەوە وەکدیتت نوسیومـە ( ئـازادی گەل - ئازادی ئاموزام ) هەرواش دەنوسم تابڕیاریك دەردەچێ بە جۆرێکی دیـکە بنوسرێ . ( ی ) ئیسمی مەعنا بەقەدەـی نیسبەتو هەمتو ئەو ( ی ) یەئەسلییانە کەدەکەونە کوتاییی وشەوە درێژاییـــی هەیە . کەدەڵێی ( هەولێری ، جوانیی ، ترۆزی ، شاییی ) یێیـــەکان بەقەدەر یەکدین . بەڵام کەدەڵێی ( خەلـقی شارەزوور ) ئـەم یێیەی ئیزافەی دوای شارەزوور بەئانقەست نەبێ درێژناکرێتەوە . هەروەهاش کەدەڵێی ( بەردی رەق ) .

ورد بـونەوە یێکی دیکەش هەیە لەم باسـەدا زیاتر چاومان دەکاتەوە بـۆ دۆزینەوەی حقیقەتو شارەزاتریـشماندەکا لەهەنـدێ

باری سەلیقەی کورد کەزمانەکەی پێی داناوەو بەمەدا جارێکی دیکەش بۆمان ئاشکرادەبێ کەوا (ی)ی وەسفو ئیزافەو شەخسی یەکەمو دوەمو سێیەم ناچنە ریزی (ی) نیسبەتو ئیسمی مەعناوە.

لەومیسالانەی لیرەبەپێشەوە بەپێی پێویست هێنامانەوە بۆمان دەرکەوت کەوا (ی)ی ئیسمی مەعناو نیسبەت سەر رای ئەوە کەدرێژن تالە ئیمکانیشدابێ هەر بەدرێژی دەمێننەوە. وەك دیتمان کەدەکەونە دوای پیتەبزوێنەکان (ی)یەکی پەیوەندی دەکەویتە میانیانەوە هەتا ممکنبێ تلفظیان پێبکرێو بەدرێژی بمێننەوە. دەلێی (بەغدایی، شنۆیی، شەقلاوەیی.. بۆنیسبەت - دارایی، فیزۆیی، گەورەیی.. هتاد بۆئیسمی مەعنا). بەلام (ی)یەکانی شەخسی یەکەمو دوەم سێیەمو وەسفو ئیزافە کەدەکەونە دوای پیتە بزوێن بۆ خۆیان لە بزوێنی دەکەون ودەبنە دەنگدار Consonant واتە (ی) پەیوەندی نایێ وبیان پارێزێ. دەلێی. (هەرای پار، خانەی بارام، سەکۆی دوکان، پشتی ئاشتی، جێیمن.. بۆ ئیزافە - هەرای گەورە، خانەی بچوك، سەکۆی بلند، پشتی درێژ، جێی دوور.. بۆ وەسف)، یاخود دەلێی (خەیات دروی، قەساب گروی.. بوشەخسی سێیەم) هەروەها (ی)ی شەخسی سێیەم کەچوە دوای مفعولێك پیتی کۆتایی بزوێنبێ بۆخوی لەبزوێنی دەکەوێ دەلێی (کردی.. هەرای کرد، هەلەی کرد، درۆی کرد.. هتاد) بەمەدا جارێکیدیکەش بۆمان مەعلوم دەبێ (ی)ی ئیزافەو وەسفو شەخسی یەکەمو دوەم وسێیەم ناچنە تای تەرازوی (ی)ی نیسبەتو ئیسمی مەعناوە.

دەوجا کە «ی»یەك کورتتربێ لەیەکێکی دیکەو بەپێی کورتیی و درێژیی لەنوسیندا جیاکرانەوە بۆ دەبێ «ی»یەکی مردو زیندوکرێتەوە؟ کواتێکەڵ بونی مەعناو سەر لێشێوان. کەویستت بڵێی (أوز أبیض) بنوسە (قازی سپی) کەویستت بڵێی (القاضي العالم، قاضي البصرة) بنوسە (قازیی زانا، قازیی بەسرە).

«ی»ی وشەی (قازی) بێیەکی درێژە بەوە فەرق ناکا «ی»ی ئیزافە ووەسفی بەدوا دابێ یانەبێ. چ بڵێی (قازی هات، قازی لێرەیە، قازی زانایە. [لێرەدا وشەی قازی «مبتدأ» ە یێی وەسفو ئیزافەش لەدوا «مبتدأ» ەوە نایەن]) چ بڵێی (قازیی بەسرە، قازیی زانا) لەهەمو حالانزدا «ی»کەی وشەی (قازی) فەرق ناکا لەلایەن کورتیی و درێژیەوە ئیتر بۆ دەبێ بەملێنین ڕێزمان داوادەکا بنوسرێ (قازی زانەیە، قازی هات، قازیی زانا، قازیی کفری) بۆ عینادنەبێ وەلامێك نیە.

دیتت گوتم (تا لەئیمکانیشدا دابێ هەر بەدرێژی دەمێننەوە)، ئەمەم بۆیەگوت چونکە وادەبێ ئەو ئیمکانە وەزەحمەت دەکەوێ. «ی»ی نیسبەت و ئیسمی مەعنا (لەراستیدا هەمو یێیەکی تیژی کۆتایی وشە وەك هیی نیسبەت و ئیسمی مەعنا) کە «ان»ی جمعی بەدوا داهات ئەودرێژیەی نامێنێ. دەڵیی (راستی — راستیمان گوت، راستیتان گوت) بەلام کەویستت بو جمعی غایب بێ دەلێی (راستییان گوت). هەرچەند نوسەران لەنوسینی ئەم سیغەیە یەك جۆر نانوسن واهەیە دەنوسری (راستییان، راستیان) بەلام ئەوەی

ھ ـ ردەگوتری شتێکە کەوا «ی»کەی ( راسـتـتی ) درێژایتی خـــۆی
خوێـدوە . ھەروەھا دەڵێی (ترۆزییان خوارد) لێرەشدا «ی»کەی
ترۆزتی ) کورت بوتەوە . ھەمان شکل کە بچتە بزوێنی «ە» کەوتـە
تو ئەم «تی» یە درێژانە کورتیان دەکاتەوە ، دەڵیی (ئەم تەرۆزییە)
ەگوێندا ناڵێی (ئەم تەروزتیە) ھەرچەند بەنوسێن واشیبنوسی[1]
ئەم مشکلەیەش یەکێکە لەوگرفتانە کەدەبێ بڕیارێکی گشتی بۆبدرێ
ـ رێنوسەکە ببێ بەیەك شکڵ ولەسەر بنچینەیێکی راستیش ھەلستابێ .

تاتێرە کارێکی کورد کردوەتی کارێـــکی عادەتییە . لەمادەی
ڕەسیەتی ) و وردەکاری جیاکردنەوەی «ی»ی درێژو کورت نەبێ
کەرێدە ژێریێکی تێدایە ، دەستورەکانی دیکە ھاوتای ئەو دەستورانەن
مزۆر زمانی بێگانەدا رەچاودەکرێن . بەلام کورد ھەنگاوێکی یەکجار
پـچۆزانەی ھاویشتوە لەداڕشتنی جۆرێك ئیسمی مەعنادا پلە یێکی بەرز
زۆرۆی ئەو پلە سەرەتاییە کەوتـوە کە کوردو غەیـری کورد تێیدا
ھوبەشن . لەمھەنگاوددا مەبەسێـکی پێـك ھێناوە لە زمانەکانی دیـکە
ھۆی پێك ھێنانیان نایەتـە بەرچاو یاخــــود نەھاتۆتـە بـەر چاوی
من . بابزانین ئەم ھەنگاوە چییە بەولای داڕشـــتنی ئیسمی مەعنای
عادەتییەوە . !

تاقمێك ھەن لەئاوەل ناو سەرڕای ئیسمی مەعنای عادەتی کەتازە
باسمانکرد ، جۆرێکی دیکەی ئیـسمی مەعنایان لێدادەڕشـترێ واتایان
خۆجیاواز دەکاتەوە لەواتای جۆرەکەی عادەتی بەھـۆی ئەمرازیـکی

---

(۱) ئەم لاباسە درێژەی زیاتر تێدایە ، بەلام بەوەندەوازم لێی ھێنا .

تایبەتییەوە . سرنجت بدە ئەم کۆمەڵە وشانەو ئیسمی مەعناکەیان .
دەڵێی (خۆش ، خۆشی ـ جوان ، جوانی ـ کۆن ، کۆنی ـ ڕێك ،
ڕێکی ـ نوێ ، نوێیی ) . بەدوا ئەمانەدا دیقەت لەم وشانەو دوجۆری
ئیسمی مەعناکە یان بگرە . دەڵێی (درێژ درێژی ، درێژایی ـ پان ، پانی ،
پانایی ـ قوڵ ، قوڵی ، قوڵایی ـ ڕەش ، ڕەشی ، ڕەشایی هەموو ڕەنگەکان
وەك ڕەشوان ـ قورس ، قورسی قورسایی ـ شیرن ، شیرنی ، شیرنایی
هەموو تامەکان وەك شیرن وان ڕاست ، ڕاستی ، ڕاستایی . . ) .
لێرەدا وەك دەبینی وبەپێی ڕای خۆم بۆشت شەرح دەدەم
وردبینییێکی تایبێتی زیرەکانە دێتەبەرچاو لەکاری فەیلەسوفی زمان
دەکا زیاتر لەوە زادەی سەلیقەی میللەتێك بێ . سەرنج
دەری دەخا هەموو ئەو مەعنایانەی بە جۆرێك تحدید دەکرێن (وەك
بەمەساحەو پێوانو هەڵکێشان ) یاخود هەستێکی مادی تەواویان
پێدەکرێ (وەك تامکردنو دەستلێدان ) ، ئائەو مەعنایانە هەڵدەگرن
لەمطلق دابڕێنو مقداریان دیاری بکرێ ، بۆئەم تحدیدو دابڕینەش
پێتی «ی» بەکەڵك نایێ چونکە بۆ مطلق بەکاردێو ناتوانێ هەنگاوێکی
دیکە بەولای مطلقەوە بڕوا ، ئیتر زیرەکی فیتریو هەستی عەفوی
ڕاست کوردی بۆئەوە بردوە سێغەیێکی تایبەتی « وێچوو » پەیدا کا
مەبەس ڕاگەیەنێ ، ئەم سیغەیەش بەئیزافەی « ایی » نەك تەنها « ی »
پەیدابوە .

کەگوت « پانی » بەوەدا « عرض »ی مطلق ڕادەگەینی بەڵام
کەگوت « پانایی زۆرە کە » مەبەست ئەو هەندە مسافە تحدیدکراوەیە
کەلەودیوار بۆ دیوارەکەی بەرامبەری دەگرێتەوە ، ئەوهەندە مسافە

ە (مطلق) ی واتای (پانتی) دادەبڕێ . هەروەها درێژی (مطلقی طول) ە
ەلاە درێژایی هەندێکی تحدیدکراوە لەو درێژییە . وشەی (راستی) کە
ەبەست داڕشـــتراوە مانای (استقامە) یە بەلام ڕاستایی مقدارێك
ێـگە وەیا زەوی ڕاست وبێ خواری‌و نزمی‌یە . ڕاسـتایی بۆقسـەو
ـیرو باوەڕ نابێ چونکە لەمانەدا تحدید تصـورناکرێ . زەردی مانـای
صفرە ) یە بەلام زەردایی ئەوەندە ڕەنگە زەردەیە کەلەسەر شـتێك
ەجێ‌دەمێنێ لە نەتیجەی دانانی بۆیاغی زەرد لەسەر ئەوشـتەدا ، یاخود
ئەو مقـدارە رۆناکیەیە کەچاوێـکی زەعیف دەیبینێ ئیـتر دەگوترێ
« چاوی فلانەکەس کوێرنەبوە زەردایی دەکا » . کە گوتت ( رەشایی )
مەبەست مقدارێکی دیارکراوە لە ( ڕەشـــی )] وەك ڕەشایی زەلام
نەشەودا یاخود رەشایی خەلوز کەلەسەر جێگەیەك دەمێنێتەوە . (ترشی)
بەرامبەری ( حموضة) یە ، بەلام ( ترشایی ) ئـەو تامەیە کـە بەزمان
دەیچێژی بۆیە دەگوترێ ( ترشایی سماق زیاترە یاکەمترە لەهی لیمون
دزی ) . هەروەها شیرنایی‌و تالایی‌و تفتایـی مقدارێکن لەشـیرنی‌و
تالی‌و تفتی . لە پێنج هەســـتەی ( حواس خمس ) ئادەمیزاد تەنها
بۆهەســـــتی چیشتن‌و ( لمس ) کە لەگەل مادە تێکەل دەبن وەیا بەیەك
دەگەن ( بەیەك گەیشتنی مادە لەگەل مادە ) ئەم ســـیفەیە بەکاردێ
ئەوەی دەدیترێ‌و بۆن دەکرێ ودەبیسترێ بەرادەی چێشتن‌و دەس‌لێدان
( لمس ) هەستی مادیبان پێ‌ناکرێ بۆیە ئەم سیفەیان لێ‌ناوەشێتەوە .
ناگوترێ ( جوانایی ودرۆزنایی‌و دەنـگ‌خۆشایی‌و بێن خۆشـایی ) .
دیارە ئەو مانایەی کەهەر بە زیهن دەزانرێ بە جارێك لەوە دوره (ای)
بۆ بەکاربێ (ڕەزیلـی‌و حەق پەرســـتی‌و نیشـتمانیەروەری‌و هەمو

مانایێکی زیهنتی وەك ئەمانە ) لەسیغەی عادەتـتی بەولاوەیان نیــە .
ئەمە دەستورێکی گشتی‌یە ، بەلام ئەگەر وابو یەك لەوهەسـتانەی بەر
دیتن‌وبیستن وبێن‌کردن دەکەوێ مومکین بو تحدیدبکرێ وەیاگەیشتە
پایەی مادییەت لەهەست پێ کردنیدا ئەوسا قاعیدەکە دەیگرێتەوە .
بومیـال دەڵیم بۆنێك کەزۆر کە سکوون بو تـاوای لێ‌هات ببێ بـە
خزمی تام‌کردن وشەی ( تیژایتی ) بو بەکاردێ وەك « تیژایتی بۆنی بیبەر »
زاتەن تیـژایتی بۆ تام‌کردنە . هەروەها ئەو مقـداره رۆناکیەی کە
لەدرزێـکەوە دەدیترێ پێـی دەگوترێ رۆناکایـتی چونکە تحدیـدی
تێدایە . لەڕۆناکایتی ڕۆژیشدا تحدیدهەیە چونکە دەوەستێ بەرامبەر
تاریـکتی وەیا تاریـکایتی‌شەو ، واتا هەریەکەیان لەڕێی مقابـلە لەگەل
ئەویتردا تحدید پەیدادەکەن‌و لەمطلق دەپچڕێتەوە .

لێرەدا باجارێـکی دیـکەش سەر لە ( سپـتی ، سپیەتـتی ، سپیایتی )
خوارکەینەوە . بو مانای مطلقی ( بیاض ) سسپیەتتی بەکاردێ‌و لـێرە
بەپێشەوە گوتمان ئەو سیغەیە بۆیـە هاتــۆتە ناو نەوەك ( بیاض و
ابیض ) تێـکەڵ‌بن . دەبینین سیغەی « سپیایتی » ش هەیـە بـەلام
وەنیە وەك سپیەتتی بێ مانای ( بیاض ) ی مطلق بگەیـــنێ . دەڵێی
( ئەمە سپیایتی گەچەکەیە یاخــــود سپیایـتی بەفرەکە لەدوورەوە دیارە )
معلومە گەچەکەو بەفرەکە دوشتی محدودە بویە گوترا سـپیایتی نەك
سپیەتـتی . هەر بۆیەیشە بە ( شیرو ماسـتو رونو پەنیرو دۆ ) ش
دەڵێن سپیایـتی چونکە ئەمانە سەرڕای رەنـگی سـپییان محدودن‌و
دەشخورێن .

ئەم سێیەمیە جگەلە زەکاوەتـی جیاکردنەوەی ( محـدود ) لـە مضق ) ، لەلایەنی داڕشتنـیشەوە زەکای تێدایە : پیتـی « ی » کە پیتێکی نەرمو شلەو لەسەر زمان سوکە لایقە ببی بـە ئەمرازی دەرشتنی مانای مطلق لە ئاوەڵناوەوە کە ئەویش خـۆی لەخۆیـدا مەدیەتی تێدانیە ، ئەمە بە جورێکی گشتی : بەلام ئاوەل نـاوێك کە هەسـتی مادی پێ‌بکرێ لەڕێی تام‌کردنو دەسـت‌لێ دانـەوە ، وەیا قابلیتی تحدیدو پێوانو کیشانی هــەبی ( کەهەمـوی کـرداری مەدین ) دەبێ کارێکی سەختتری لەگەلدا بکرێ بۆئەوە ئەو مەعنایـە تحدیدکراوە ببەخشێ . « ی » ی تەنها کوڕی ئەومەیدانەو هەلـگری ئەوبارە نیە بۆیە ئەمرازێـکی نیسبەت بەو قورسی بو بەکارهاتوە کە سێ پیتی ( ایتی )یە . بەپێی گرنگ بونی داڕشتنی ئیسـمی مـەعناکە ئەمرازەکەش گۆڕاوە بۆ درێژتری . ( ی ) لایقە بـۆ واتای مطلق . ( ایتی ) لایقە بـۆ دابڕین و بەرەو مادییەت بردنی ئـــەو مقدارەی کە لە مطلقە کە دەپچڕێتەوە . ئەوەش دێتە بەرچاو کە پیتی «ا»ش وەك « ی » نەرم‌وشلە لەگەل سروشتی ئاوەڵ ناودا دەگونجێ دەوجا هەروەك ئەمرازی « ی »ی وشـەی « پانێتی » هەمڕێك دێ لەگەل « پان » کە ئاوەل‌ناوە وهـەم بەسێشە بو وەرگرتنی مانـای مطلق ، ئەمرازی ( ایی ) شڕێك دێ لەگەلێدا وبەسێشە بۆ دابڕینی هەندێك مسافە لە مطلقی « پانێتی »و پێك هێنانی ئەو مادییەتە کە لەوشـەی « پانایی »دا ڕەچاودەکرێ . ئەوتێبینیە دەمینتەوە کە بڵێم لەسێ‌پیتی (ایتی) ئەلفەکەو پێ‌کەی کۆتایی بنچینەیین وێی‌کەی بەینیان ئالقەی پەیوەندی‌یە چونـکە وەك گوتمان لێرە بەپیشەوە پیتەبزوێن ناچێتەسەر

پێتەبزوێن ئەگەر یەکێکی دەنگـدار نەکەوێتە بەینیانەوە .

بەرلەوە بگوێزمەوە بۆ داڕشتنی ئیـمتی مەعنا لەدوَجـۆرەکەی دێکەی ئیسمیمادە دەمـەوێ هەندێك لە ســەر وشەی گــەرم و ساردو گەرماو ســەرما بدوێم چونکـە دارشتنی ئیسمی مەعنـــا لەم وشانەدا گرێ و گالێ تێدایە پێویستە بەقەدەرحاڵ روَنبکرێتەوە . لەوشـــەی ( گـەرمایتی ) دا زیهن بۆئـەوە دەڕوا لە ( گـەرما ) وەر گێرابێ . بــەلام وردبونـــەوە دەری دەخا لەوشەی ( گـەرم ) وە هاتوە نەك ( گەرما ) . کەدەڵێی ( گـەرمایتی ) ئاگرم بـۆ هات دیارە مەبەست مقداری هەست پێکراوی ( گەرمێ ) ئاگرەکەیە نـــەك ( گـەرما )ی ئاگرەکە چونکە معلومە ناگوترێ ئاگر گـەرمایـە ، کەواتە نابێ ( گەرمایـتی ئاگر ) لە ( گەرمای ئاگر )ەوە هـاتبێ . دەگوترێ ئاگر گەرمە دەوجا بـــە پـێی دەستوری باسلێکراوی لێرەبەپێشـەوە ( گەرم ، گەرمێ ، گەرمایتی ) داڕشتنێـکی راســت و دروستەو سەرپێچێ تێدا ناکرێ و دەگوترێ ( گەرمایتی خوێن وەیائاگر وەیارۆژ ) . . هتاد دیقەت بگرە لەوشەی ( سەرما ) : ئەم ( مـا ) یەی کۆتایێ وشەکە لەئەسلدا وجودی نیە . نەك ( ما ) بەلکۆ پێتی ( م ) یش هەر وجودی نیە چونـکە معلومە ئەسلەکە وشەی ( ســـارد ) ە . کەواتە لەڕێبازێـکەوە کەتائێستا نازانێن ( باڵێم من نازانم ) ســەر رشتەکەی چیە ئەم ( ما )یە بۆ ساردو گەرم هاتـــوە وکردوَنێ بە ( گەرماو سەرما ) . بە پێێ قیاس دەبێ بە ئەسل ( ساردماو گەرمما ) بوَبن و کورت کرابنەوە بو مەبەسی ئاسانێ تلفظ . لـەبەکارهێنانزدا ( سەرماو گەرما ) جارێـکیان وەك ئاوەل ناو خۆدەنوێنن و جارێـکیان

وەك ئیسمی مەعنا . كەدەڵێی ( ئەوڕۆ سەرمایە یا گەرمایە ) لێردا ئەوەی ناون وەك ئەوە یە بڵێی ( ئەوڕۆ خۆشە یافینكە یاسـاردە یا گەرمە ) . كە دەڵێی ( سەرماو گەرمای دوێنی ) هەردوَیان لەئاوەڵ ناوی دەشۆرێن دەبنە ئیسمی مەعناو واتاكەیان دەبێتە (ساردیو گەرمی ) . مەیلم بۆئەوە دەڕوا كە لەئەسڵدا هەردوَیان ئیسمی مەعنا بوبن بەلام لەڕێی ( مجاز )ەوە بە مروَری كات وەك ئاوەڵ ناو بەكار هاتبن . دیققەتبگرە كەدەڵێی ( سەرما مە یا گەرمامە ) بەوجۆرە بەكاری دێنی كە بڵێی ( خوشیمە یا شادیمە یا ناخوشیمە ) معلومە (خوشیو شادی وناخوشی ) هەمویان ئیسمی مەعنان .

دەڵێی ( ساردایی بەفرەكەم هەستپێكرد ) ناڵێی ( سەرمایی بەفرەكە ) مەبەستیشت ئەو میقدارە ساردییە یە كە لەبەفرەكەوە هەلدەستێ ، لەهەندێ ناوچەكانی كوردستان دەگوترێ (ساردایی . هاتۆتە بازاڕ) مەبەس لەو ساردایییە بەفرو شەربەتو ماستاوو خواردنەوەی هاوینییە هەروەكمەبەس لە ( سپیایی ) شیرو ماست وكەردو هاوڕێكانیەتی .

بۆ داڕشتنی ئیسمی مەعنـا لەدوَ جۆرە ناوەكانی دیكە دوَ ستیغە هەن یەكیان بە زیادكردنی (ەتی) ئەوی دی بەزیادكردنی (ایەتی ) لەكۆتایی وشەدا . بەپێی ئەوە ئەمرازی قورس لا یقترە بوشەو واتای قورس دەبوا ( ایەتی ) بەكارهاتبا لەگەل ئیسمی مادەی تەواودا وەك بەردو دارو ئاسنو چیا . دەمایەوە (ەتی ) بۆ جۆرەكەیدی . بەلام وا دەردەكوێ لەڕێی ( استقراء )ەوە مانەوەی زمانی كوردی بەبێ نوسین بۆ ماوەی هەزاران ساڵ وایكردوە ئەو دەستورانەی لەیەكدی

نزیکن تێکەڵ بەیەکدیێ ببن و یەکیان لەجێی ئــەوی‌دی بــەکاربێ .
هەلبەت ئەمەش شتێکی سەیرنیە بەلکو ڕوەدانی سەیرە : تۆ بنوارە
زمانی عەرەبێ لەگەل ئەوەشدا کە ١٣٠٠ ساڵ زیاترە بەهۆی قورئان و
بەدوا قورئاندا بەهۆی نوسینەوە ڕێزمانی پارێزراوەو لەزۆر بنگەی
خوێندن و ڕۆشنبیریێ‌دا هەر بەو زمانە ڕێزمانیە وتوویژ کراوە دیسانەوە
زمانی قسەپێکردنی عەرەب نەخزمایەتێکی ماوە لەگەل ڕێزمان نەهێچ
لەهجەیێکی بەلەهجەیێکی تری ددچێ . ئەگەر قیاسی کوردێ لەعەرەبێ
بکەین ، دوَر کەوتنەوەی زمانی ئاخاوتنی کوردی لە ڕێزمانی بنچینەیێ
گەلێك کەمترە لەهێ عەرەبێ ، واتە زمانی وتوویژی کوردێ نزیکترە
لە دەستــوورو ڕێزمان تاعەرەبێ . شتێــکی‌مەعلومێشە لەرێزماندا ئەو
بەشەی وردێ و جۆرجۆرێ تێدابێ ئامادەترە بۆ گــۆڕان و تیکەڵ بوون ،
وەك كلافەی هۆندنەوە تاداوەکانی باریکترین زوَتر دەئالۆزێ و درەنگتر
گــرێــکانی دەکرێنەوە . بەوپێیە دەبێ لەکوردیێ‌دا بە ئەسل دارشتنی
ئیسمی مەعنا لەسەر بناخەیێکی زۆر مەحکەم هەســتابێ چونکــــە
تائێستاش شوێنەواری کوێرنەبۆتەوەو هەمو سێغەکانی یا شە قامێــکی
ئاشکرا یا ڕێچکۆلەیێکی دیاری هەرماوە . وەك لەمیسالاندا دیتمان
چوار سیغە هەن بو ئسمی‌مەعنابە زیادکرنی ( یێ ، ایتی ، ەتی ، ایەتی ) لە
کۆتایێ وشەدا . هەریەك لەو سێغانەش بو مەبەس و مانایــــەکی
تایبەتی بەکاردێن · لەوزمانانەی کەمن شتێــکیان لێ‌دەزانم یەکێــکیان
ئەو وردەکاریەی تێدانیە لەو مەیدانەدا . هەرچەند ئەو رایــەی لێرە
بەدواوە دەربارەی ئەو مەوزوعە دەری‌دەبڕم بەشێــکی لەتخمینەوەدێ بەلام
وەنیە تخمینەکە لە بۆشیەوە هاتبێ یاخود بەپێێ هەوە سبازێ بێ .

من بۆ ئەوە دەچم کە لەئەسلدا ئەمرازی (ەتی) بۆ ئەو ناوانە بۆبی کە ئیسمی مادەی تەواوتێن وەك (ئەندام ، قایمقام مهندس) بەلکو شتێکن لەبەینی مادەو ئاوەلناو [وشەی قایمقام ومهندس بو میسال دێنمەوە دەنا معلومە لەکوردی کۆندا ئەو وشانە نەبون]. بەو پێیە ئیسمی معنایان دەبێتە (ئەندامەتی ، قایمقامەتی ، مهندسەتی ـ بە نوسینی کوردی موهەندیسەتی) . ئەمرازی (ایەتی)ش بو ناوی مادەی تەواوبوبێ وەك (بەرد ، زێڕ ، زیو) ئیتر گوترابی (بەردایەتی ، زێڕایەتی ، زیوایەتی) . لەوانەیە زیهن بۆ ئەوە بچێ کەئەم سیغانەو بەکارهێنانیان عەرەب گوتەنی (سماعی)ن بەلام ئەمە دوورە لە قاناعەت چونکە لە (سماعی)دا ئەوەی ڕچەیە (اطراد) بەدی ناکرێ و هەر وشەیەك بە ڕێکەوت بۆ خۆی لەڕێبازێکەوە ڕۆیشتوە. دیتومە لەزمانی عەرەبیی (استثناء) لە ئەژماری وشە دەستوریەکان زیاتربوە لەگەل ئەمەشدا ژیربوتی چەند وشەیێك و لەیەكچونیان بوە بەبنچینەی دەستورێك وئەوەی بەردەستور نەکەوتبێ هەرچەند زۆریش بوبێ پێی گوتراوە (استثناء) تەماشاکە لەکوردیدا ئەو وشانەی پەیوەندی شەخسی (وەك خزمایەتی یا جنسیەت) رادەگەینن زوربەیان بە (ایەتی)دەگۆڕێن بو ئیسمی مەعنا وەك (خوشکایەتی ، باوکایەتی ، خزمایەتی ، ژنایەتی ، کچایەتی ، کسایەتی ، ئامۆزایەتی ، خالۆزایەتی ، پورزایەتی ، مێردایەتی ، بەدوائەماندا کوردایەتی عەرەبایەتی ، تورکایەتی ، عەجەمایەتی ، ئینگلیزایەتی ..) چاوپۆشێن لەڕچەی ئەو هەمو وشانەو چون یەکیەتیان لەوانە نیە بایەخێکی هەبێ چونکە دەستوری زمان

بناخەیێکی لەوە بەهێزتری ناوی تادەبێ بەدەستور . بەڵی ئـەم دەستورە ش (استثنا)ی هەیە : وادەردەکەوێ ئەو وشـانەی پیتی (ا)یان تێدابێ لەبەر نەقۆلایتی کۆ بونـەوەی دو (ا)لەوشەیێکدا بەئەمرازی (ەتی) اکتفا دەکرێ بو ئیسمی مەعنایان وەك دەڵێـی (پیاو ـ پیاوەتی) خۆش نیە بڵیی (پیاوایەتی) لەبـەر درێـژی وقورستی دەنا دەبوا وەك گوتت (ژنایەتی) بشڵیی (پیاوایەتی) . یاخود دەڵێی (برایەتی) کەچی دەبوا بڵیی (برایایەتی) چـونکە ئەلفەکەی کۆتایتی وشەی (برا) ئەمرازی (ایەتی) قبول ناکا بـێ ئالقەی (ی) بەلام دیارە بوکورت کردنەوە وازهێزاوە لەو (ی)یەو اکتفاش کراوە بەیەك لەدو (ا) کەی (برا)و (ایەتی) . هـەروەها ناوی گەل کە ئەلفی تێدابێ ئەویش بە (ەتی) دەگۆرێ بۆ ئیسمی مەعنـا وەك (ئەلمان ـ ئەلمانـەتی) لەبەر قـورستی ناگـوترێ (ئەلمانایەتی)[1] . ناوی گەلێکێش ئەگەر بـە (ی) نیسـبەت لەکۆتایتی ولاتەکەدا پەیـدا بێ وەك (هـۆلەندەیتی ، فنلەندەیتی ، نەرویجتی) ئیسمـی مەعنای بـە زیادکـردنی (ەتی) دەبـێ وەك (هۆلەندەییـەتی ، فنلەندەییـەتی ، نەرویجیەتی) . لەوشـەی

---

(١) بەزاندنی پیتی (ا) نەك هەر لێرە ، لەشوێنی دیکەشدا رەچاو دەکرێ وەك لەومیسالانەدا : دەڵێی (دەستاو دەست ، دەماودەم ، دزاودز ، دەشتاو دەشت) بەزیاد کردنی دوپیتی (ا ، و) . بەلام دەڵێی (مالەو مال ، بانەوبان ، شانەو شان ، دارەودار ، شاخەو شاخ ، زارەوزار) بەزیادکردنی دوپیتی (ە ، و) . دیارە لەو وشـانەدا چونکە پیتی (ا) هەیە بو مەبەسی سوك گوتن پیتی (ا) گـۆزاوە بـۆ (ە) دەنا دەبوا بگوترێ (مالاو مال ، باناو بان ، شاخاو شاخ . . ) .

(ئیتالیاو ئیسپانیاو ئوکراتیا)و ناوی وەکو ئەمان ئەگەر نیسبەتەکەیان بکەیتە (ئیتالیایتیو ، ئیسپانیایتیو ئوکرانیایتی) ئەوا دەبێتە (ئیتالیاییەتیو ئیسپانیاییەتی .. هتاد) خو ئەگەر نیسبەتەکە بکەیتە (ئیتالتیو ئیسپانتیو ئوکرانی ـ کە ئەمەسیغە یێکی عەرەبتی زیاترە لە کوردتی) ئەوسا دەڵێـــی (ئیتالیەتیو ئیسپانیەتی .. هتاد).

ئەوەش تێبینتی دەکرێ ئەگەر وشەی وەك (خۆیتی) لەنیسبەتدا دوَ (ی)ی تێدابو بۆ ئیسمی مەعنا دەبێتە (خۆییاتی) نەك (خۆییایەتی) دیارە بۆمەبەسی ئاسانتی ئەم «ی» کەی دوایتی فرتاوە . بۆیە دەگوترێ «کۆییاتی» . بەپێی قیاس دەبێ بگوترێ «شنۆییاتی ، هێرۆییاتی ، هەلشۆییاتی ـ کە لە شنۆیتیو هێرۆیتی هەلشۆیتییەوە وەرگیراون» .

شتێکی دیکەش سەرنج بۆ خۆی ڕادەکێشێ : ناوی ئەو کەسبو کارەی کەمانای ئاوەڵناوی تێدا بەهێزو ئاشکرایە ماملەتی ئاوەڵناوی لەگەلدا دەکرێ وەك (سەپانتی ، جۆتیارتی ، وەستایتی ، شاگردتی ، پاسەوانتی ، سەرتاشتی باغەوانتی ، کابانتی .. بەقیاس لەمانەوە وشە عەرەبیەکانیش دەبنە : نەجارتی ، خەیاتی ، تەباختی ، قەسابی . هتاد).

بەلام وەکو گوتم لەئەنجامی بەکارهێنانی زارەوزاری هەزاران ساڵو لەبەر نەچەسپاندنی ڕێزمان بە نوسینو تۆمارکردن هەلبەت تیکەلبون پەیدابوە لەمیانی ئەو سیغانە تاوای لێهاتوە سنوری ئاشکرا لەمیانی هەندی لەو سیغانەدا هەلگیراوە . لەگەل ئەوەشدا هەل نەدۆزاوە بو بەربەستکردنی کوێربونەوەی سنورو تێك چونی ڕێزمان :

زمانزانانو ئەدیبانی کورد دەتوانن بڕیاری ئەوە بدەن کە فلان سیغە بو فلان مەعنا بێ. ئەوەندە هەیە کارەکە زۆر ئاسان نیە هەم لەبەر ئەوە وردبونەوەو لێکۆلینەوە و لێکدانەوەیێکی زۆری دەوێ و هەم لەبەر زەحمەتی ( نالێم استحالة ) ڕێککەوتنی ئەدیبەکانمان لەسەر ڕایەکی هەمەگتی .

بێ گومان ئەم باسەی داڕشتنی ئیسمی مەعنا ئەوەندە فراوانە لەوانە نیە بخرێتە ریزی کومەلە باسێکو ببێ بە ئالقەی زنجیرەیێک ، خوی بە تەنها ئەوەندە ئالقەی تێدایە ببێ بە زنجیرە . بەلام بەنیسبەت منەوە کە لەرولی « ی » بدویم ناکرێ ئەم باسە هە لبوێرم . هەر چەند بە جورێکی ناتەواو وتێوە چاتێش بێ لێدوانی پێویست بو ، وادەزانم سودبەخشیش بو بێ . کردنەوەی دەروازە لە زورێکی مەنفەز بەڕاوی زمانەکەمان هەروەك زورەکە روناك دەکاتەوە هاتیشمازدەدا بوکردنەوەی دەیان زوری وەك ئەو کە تائێستا بەداخراوتی ماونەوەو جالجا لوکەی فەرامۆشتی شوێنەوارو دروشمی شاردوتەوە . بەکباوەش خامەی زیرو دلسوز ببن بەگەسك ئەوجا دەتوانن زیسی جالجالوکەو توزی بێخزمەتی لەو زورانە بتەکێننەوە . خامەی من ئەگەر بەقەددەر تاکە قەسەلێکی ئەو گەسکە هەولی مالێنو تەکاندنی دابێ خوم زور بە بەختیارو سەربلند دەزانم .

ئەوەی ماوە لەباسەکەم دەربارەی رولی « ی » پێویستی بە شرح و قول بونەوەیە ، رەنگە هەر بە ژماردنی جوری بەکارهێنانی لێی بێنەوە .

لە فیعل : بو جەمعی قسەکەر ( جمع المتكلم ) لە ئایندەدا « ین »

ەکاردێ وەك « دەخـوین ، دەکەین ، دەژۆین ، هەلدەسـتێین » لەفیعلی « بناء مجهول » بو مازی « ین » بو ئاینده (ێین) دێته ناو وشـەکـە وەك « دیتراین ، دەدیترێین ـ نوسراین ، دەنوسـرێین ـ ائێدراین ، لـێ دەدرێین » . تاقمێك فیعل هەن لەکوردیدا من پێیان دەڵێم (افعال الوقوع فیعلی روَدان ) فاعیلەکانیان بەشـتێك هەلناسـتن ئەوەی رودەدا لەخۆوە ژوَدەدا وەك ( رما ، سوَتا ، برژا ، دڕا ، پسا ، خلیسکا ، کولاَ ) هەموَیان کۆتاییان بە بزوێنی (ا) دێ تصریفیان وەك تصریفی بنا مجهول وایە . (ا) کە لەئاییندەدا دەبی بە (ی) وەك (سـوَتا ، دەسوتێ ـ ژما ، دەژمێ ) کە ئەمە فەرقی نیە لەگەل تصریفی نبا مجهول وەك (دیترا ، دەدیترێ ) . ئەم فیعلانە لەژوَی کارنەکردنی فاعیلیانەوە زور بێهێـزن لەعەرەبیدا بەشی زۆریان بەر (افعال المطاوعه) دەکەون . ئاشـکرایە بوَنی (ا) لەکـۆتایی فیعلەکە یارمەتی ئەو بێهێـزیەی داوە چـونکـە خۆی بێهێزەو بەژەللایشە ، هەر دەڵێـی بەو بێهێزیەو بەژەللایـیـیە فیعلەکە بێ خاوەند ماوەتەوە . کارێـکی یەکجار شارە زایانەو ژیرانەیە کە بنا مجهول هەمان سێنەی بۆ بەکار هاتوە ، چونکە ئەویـش مانـای تێپەژی (تعدیە) دۆزاندوەو فاعیلەکـەی لە وشـەدا نادیاربوە . هەندێ (استثناء) لەو تاقمە فیعلەی (رودان) ە هەیە وەك لەفیعلی (مردن) دا[1] دەدیترێ . دەبوا بگوترێ (مردا) بو شەخسی سێیەم لەمازی داچونکە

---

(١) فیعـلی (تۆپین) ئەویش وەك مردن وایە ، هێنـدە هەیە بـۆ جانەوەر بەکاردێ نەك بۆ مرۆڤ ، لە جانەوەریش دا غالب بۆ ئەوانە بەکاردێ کە گـۆشتیان ناخورێ . گۆشت نەخوراو پێی دەگـوترێ (تۆپیو) گۆشـت خوراو پێی دەگوترێ (مردار) .. مرۆڤیش پێی دەگوترێ (مردو) .

شەخسی مردوَ بە ئیرادەی خۆی نامرێ ، هەلبەت دەبوا چاوگەکەش ( مردان ) باوەك ( پسان ، سوتان . . . ) . بەلاّم وەك بلێی گرنیگی روَدانەکەو زێدە ناخۆشتی کەتێیدایە هێزی بە دارشتنەکەی داوە .
( هەلستان )یش [٢] لەرواڵەتدا خۆی بە ( استثناء ) دەنوێنێ : بەهۆی ئەو ( ا ) یەیوا لەکۆتایێ و شەکەدایە دەبوا ئەویش وەك ( رمان ، خلیسکان . . ) لە تاقمی فیعلی ( روەدان ) بێ کەچی ماناکەشی روَدان نیە چونکە ( هەلستان ) لەخۆوە پەیدا نابێ ، بە ویستن‌و ئیرادە دەکرێ . بەلاّم لەراستیدا ئەسلی ( هەلستان ) لە ( هەلوەستان ) ەوە هاتوە ، ئەویش فیعلە روَتەکەی ( وەستان ) ە . دیارە ( وەستان ) ماناکەی ( لەحەرەکە کەوتنی ناچاری ) یە کە فیعلیکی بێ هێز ئەم مانایە دەبێ راگەینێ .

من بۆ ئەوە دەچم کە فیعلی ( نوست ) بۆ ئەو نوستنە بێ کە ویستنی لەگەل دابێ نەك لەخۆوە بێتە سەر مروڤی بەخەبەر . ئەگەر نوستنەکە بێ‌ئیرادەی مرۆڤ بێ دەگوترێ ( خەوی لێکەوت ) . کەواتە ( نوست ) فیعلیکی بەهێزە ، بەلاّم فیعلی ( بۆرژا ) راستەو راست روَدانەو سیغەکەشی هەرئەو سیغەیە .

کە گوتمان ( ا ) یەکەی فیعلی روَدان دەبێتە ( ی ) لە ئایندەدا ( مضارع ) دیارە لەو سیغانەدا کەرا ناوەکەیان ( ی ) ی تێدایە دەبێ دوَ ( ی ) ی تێدا کۆ بێتەوە وەك ( برژاین ، دەبرژێین ـ خلیسکایت ، دەخلیسکێیت ) . لەمەشدا دەبێ فیعلەکە هی روَدان بێ واتە بێ هێز بێ

(٢) راوەستان‌و داوەستانیش خزی ( هەلستان ـ هەلروەستان ) ن چونکە ئەمانیش فیعلە روتەکەیان لە ( وەستان ) ەوە هاتوە .

ئەدا مەعلومە لەئایندەی دا دوَ ( ی ) کۆ ئابنەوە وەك دەڵێی (هەڵستاین ،
ڕ وەستاین ـ هەڵدەستێن ، ڕادە وەستێن ) . بەڵام ( وەستان ) بۆخۆی
بەهەندێ لەهجەدا وەك فیعلی بێهێز بەکاردێ : دەگوترێ ( وەستاین ،
دەوەستێین ) بەهەرجێك مەبەس لەحەرەکە کەوتنی ناچاریێ بێ بەهۆی
ماندوَبونەوە . هەرچۆنێك بێ ( استثناء ) لەهەمو دەستوَ ڕێك داهەیە ،
ئێرەش جێی ئەژماری ( استثناء ) نیە تاچتی دێکەی بە دوَکەوتین .

لەجۆرێك فیعلی کوردیێدا ( ی ) یەك دێتە ناوەوە ( انتقال )
دەبەخشێ . دەڵێ ( تفەنگێکم گرتە تێشانە ) ، بەلام کە مفعولەکە
نەزستەدا ونکەی دەلێی ( تفەنگێکم گرتێ ) . دەڵێی ( چوَمە ماڵەکە ..
چوَمێ ـ نۆژێمە باغەکە ، نۆژێمێ ـ بوَمە مامۆستا ، بوَمێ ـ خونجامە
جێگەکە ، خونجامێ ) . ئەم ( ی ) یە کە دەچێتە دوا فیعلەکەوە ( بوَمێ ،
چوَمێ ، گرتمێ ، کەوتمێ ، نۆژێمێ ، خونجامێ ، دامێ ،
بەسوامێ ، ترنجامێ ) ئاوەلناوی شەخسی سێیەم نیە بەڵکو ( ئەمراز
وەیا پاشگر[1] ) یکە بزوَتنەوەکەو انتقالەکە دەبەخشێ . ئەم ( ی )یە
هەمان بزوێنی ( ە )یە کە دەکەوێتە دوا فیعلەکەوە لەو ڕستانەدا کە
مفعولیان تێدا دیار دەکرێ وەك گوتمانو لێرەدا دەلێینەوە
( گرتمەنیشانە ، چوَینە خانوەکە ، نۆژێمانە باغەکە ، کەوتێتە
خوارەوە . . ) .

تاکە فیعلێکی دێکەش وەك ئەمانەیە لە ( تصریف )دا بەلام

---

(١) لێرەدا ( مناقشە )ی ئەوەناکەم بزانین کە لەکوَێ‌ابێ فیعلەوە
بێ و بزوتنەوەو گوزانو انتقال پەیدا بکا داخوا پاشگرە یا ئەمراز .

واتای کەلێك جیاوازە چونکە ئەمیان (جعل) دەگەیەنێ لەرێی (جعل)ەوە کە گۆڕێن وەیا سازدانی تێدایە سەر بە ( انتقال ) دەگەیەنێ . دەلێم (دارەکەم کردە مێز ، تۆ دەکەمە پالە ، بمانکە وەکێلی خـۆت ) کە مفعولە کەونبـو دەلێم ( کردمێ ، دەتکەمێ ، بمانکەیـــێ . . ) دیارە چاوگـەی ( کردن ) بە مەعنا ( جعل ) دوَ ( مفعولی ) دەوێ ئیمـکان هەیە هەر دوَیان ونبن یا تەنها یەکێکیان . لـە راستیدا بەئەسـل ( کردن ) لەگەل ( بوَن ) سـروشتێکی تایبەتی کۆیان دەکاتـەوە کە ئەویـش ( پەیدابوَنی گۆڕان )ە لەهەردوَ فیعلەکەدا هێندە هەیـە لە ( کردن )دا مەفعول دەگۆڕێ ، لە ( بوَن )دا فاعیل دەگوڕێ . دەلێی ( بارامم کردەسەر پـالە ـ بارامم کـردێ ) دەشـلێی ( بارام بوە سـەرپالە ـ بارام بوَیێ ) . ئەم سروشتە تایبەتییە کە هەردوَیان تێیدا بەشـدارن وای کردوە بە جوَرێـکی تایبەتیش بەکاربێن کـە لەفیعلەکانی دیـکە دیارنا کەوێ . دەلێی ( بارامم کرد بە سەرپالە ، بارام بوَ بە سەر پالە) . (استثناء) هەیە لەم دەستوَرەدا ئەویش لە فیعلی( دان ، گەیشتن ) چونکە دەتوانی بلێی (پارە کەم دا بە بارام گەیشتم بەتۆ) دەشتوانی بلێی ( پارەکەم دایە بارام و گەیشتمەتۆ ) ئەگەر هێچ (اسـتثناء ) ی دیـکە هەبێ بە بێرم دانەهاتوە . لەراستیدا ئەم فیعـلانە خـۆیان و ( استثناء )یان دەبـێ لەرێی ( اسـتقراء ) ەوە دەس نیشانبکرێن ، ئەوهەندەی من لێردا نوَسیمن هەر بۆ مەبەسی میسال هێنانەوەبوَ .

لەم فیعلانەی ا( بزۆتنەوەو گوێستنەوە سـازدانە ) نەبێ هێـچ فیعلێـکی دیکە لەکوردیدا ئەم (ئەمراز وەیا پاشگر )انەی بـــۆ بەکارنایێ . ناگوترێ ( خواردمەنانێ ، دەخومێ ـ شـوشتمە چلك ،

دەشۆمێ ـ شکاندمە بەرد ، دەشکێنمێ . . ) .

بەهۆی پەیدابوونی تاوو گوێستنەوە لەشتێکەوە بـۆ شتێکی دیکە ، یاخود گۆڕانی شتێك بۆ شتێکی دیکە لەم سێنەیەدا ، فیعلی تێنەپەڕ وەك تێپەڕی لێدێ ، فیعلی تێپەڕیش کار لە دوَ (مفعول) دەکا . مەعلومە (بوون ، چوون ، کەوتن ، هاتن ، داهاتن ، نۆڕین) فیعلی تێنەپەڕن کەچی کەدەڵێی (هاتمە ژوری ، داهاتمە تەرەکە ، نۆڕیمە دیمەنەکە ، بوێتە بوێژ ، کەوتینە ئاوەکەوە ، دەچنە راو ..) وشەی (ژوَر ، تەر ، دیمەن ، بوێژ ، ئـاو ، راو ) جێی مفعولی گرتۆتەوە . کە دەشڵێی (جـلەکەم خستە ئاوەوە ، بارام دەکەمـە سەرپاڵە ، بەردێك بگرە چـــوێلەکە ، پارەکەیان بردە بانـك) دوَ مفولت هێنایەوە (جلو ئـاو ـ بارامو سەرپالە ـ بەردو چوێلەکە ـ پارەو بانك) هەر جوتە وشەیێك (مفعولی) فیعلێکن .

ئەوەش دەبێ بزانێن هەموو ئەو فیعلانەی لەمیسالانەدا بەکارمان هێنان سیغەی ئەسلیان وەك فیعلی دیکە رەفتار دەکەن ، واتە ئەگەر نەتەوێ بەتایبەتی بۆ ئەم مەبەسەی (انتقالو گوێستنەوە . . .) یان بەکاربێنێتی ، لەخۆیانەوە ئەم کردارە ناکەن . دەڵێی (تازە هاتـم ـ نۆڕیم ئەم دۆزیەوە ـ چـوێلەکەم گرت ـ پارەتان برد ـ هەرچی کاغەز هەبوو خستم ـ خانوەکە داهات ـ ماندوَ بـوین ـ گەشتیکرد ـ لەگەلتان دەخونجێین ـ کابرا گەیشت . . .) .

تائێستا بە تێفکرینێکی کەم ئەم فیعلانەم دۆزیوەتەوە لەم بابەتە بن : (خستن ، گرتن ، بوون ، چوون ، کەوتن ، هاتن ، داهاتن ، گەیشتن ،

خونجان ، پەسوان ، ناردن ، هەلدان ـ بەمانای تدخل لەقسە وەك باڵێی هەڵ مەدەیـێ ، بارام هەڵیدایێ ، کابرا هەڵدەداتێ . ) فیعلی ( هەلـکشان ) لەگەل دیار کەوتنی ( مفعول )ەکە ئـەم کارە دەکا دەڵێی ( هەلـکشامە سەری شاخەکە ) بەلام ناگوترێ ( هەلـکشامێ ) .

باسی فیعلی ( انتقال . . . ) لەوەزیاتر پیویـستی بە لێکولێنەوەو درێژە پێدان هەیە بەلام لێرەدا مەودا نیە . .

ئەم میـسالانەی خوارەوە هەندێ جوری بەکارهینانی (ی) یێشان دەدەن لەگەل پیتی تردا :

١ ـ سپییێنە ، رەشکێنە ، زەردێنە ، شلکێنە .

٢ ـ سوریێژە ، خرویلکە ، وەردێنە ( ناوی ناساغێ )

٣ ـ یەکەمێن ، دوەمێن ( پلەو روتبە )

٤ ـ آسنێن ، زێرێن ، زێتوێن .

٥ ـ گـلێنە ، مســێنە

٦ ـ کەمێنە ، زورێنە ، کونـێنە

٧ ـ جوانترێن ، خوشترێن . .

٨ ـ خوشکێ ، پورێ ، دایکێ ، کیژێ ، حورمێ ، کچێ .
(بانگهێشـتنی مێیێنە) لەفولکلـــوردا هـەیە دەڵێ ( هـێ رەوشـەنێ ، هێ چەلەنگێ پێش قوشـەنێ) . رەوشـەن نـاوی ئافـرەتە ، چـەلەنگێش کەبوە بەناودل ناو بو ردوشـەن مامەلەتی مێیی لەگەل دا کراوە .

٩ ـ مێیینە نێرینە رەنگەبچنـە رێزی (کەمینەو زۆرینە) وەك (گـلێنەو مسـتینە) چونکە تەنها جۆرە (وصف)ێك نیشـان دەدەن ، وەك گـلێنەو مسـتینە نیـن دروسـتکراوبن لە مادەیێك وبەو دروستکردنە پێکهاتبن .

١٠ـ جگێینـە ، مۆشـێینە ، هێلکـە شکـێینە ، چەڵەمەشکـێینە ، کارەمسـتێینە ، تۆپێینە ، جغزێنـە . هەمو ناوی یاری میلانین . لە ناوچەی هـەولێرو کۆیێ و هەنـدێ شـوێنی دیکەی کوردسـتانی خـوارو دەگوترێ (جگانـێ ، مۆشـانێ ، هێلکەشـکانێ ، چەڵەمەشکانێ ، کارەمستانێ تۆپانێ ، جغزانێ .. هتاد) .

یاریەك هەیە لەپشدەر پێی دەڵێن (دایە مەمدۆزە کێنە) . لەکۆیێ پێی دەڵێن (دونـگ لەمەزێ) راسـتیەکەی (گـورگ لەمەزێ) یە چـونکـە لەو یاریـەدا گـورگ لەمەزدەدا ودەی زفێنێ .

لەمـەدا دیار دەکەوێ زۆرینـــەی نـاوی یاری لەزمانی کوردیدا بە ئەمرازێك پێکدێ بیتی (ی) ی تێدایە .

١١ـ ژنانی ، کوڕانی ، کچانی و ئاوەڵنـاوی ئەوتۆیێی مانای (کەس) رادەگەیەنـێ یائافـرەتبێ وەك نێـر رەفتـار بـکا یا پیـاو بێ وەك مێ رەفتـار بکا . کە گوتت (ژنانە ، کچـانە ، کوڕانە) مانای (کەس) ی تێـدا نامێـنی ، بـۆ جالکو عادەتو راوێژ بەکاردێ .

لە هەندێ لەهجەی کوردیدا دەگوترێ (چۆمە رەواندزی ، ماڵی لە هەولێرێیە ، لەبیتوێنێدا راودەکا ، لەشنۆیێرا رویشت) .

مامەڵەتێکی تـایبەتی لەگەل ناوی شاری (کـۆ) یە داکراوە . لەحالێك دا کە زەرفو مەفعولیـش نیە دەگوترێ (کۆیـێ) . لەبەکارهێنانی ناوی هیچ شارو ئاوایەکی دیکە ئەم رێگەیە نەدراوە . دەڵێـی (کۆیێ خۆشە ، کۆیێ دیارکەوت) هەرگیز ناگوترێ (شنویێ دیارکەوت ، ئاکـۆیێ عەشرەتە ، هەڵشـۆیێ دوورە . ) . مەتەلی کـۆن دەڵێ (سەیرە لەکـۆیێ) ، ئەگەر ئەم مەتەلە بو هەولێـر با خەلقـی سلێمانی نەیان دەگوت (سەیرە لەهەولێرێ) دەیانگوت (سـەیرە لەهەولێر) . وەنیە ناوی شارەکە بە ئەسل (کـۆیێ) بێ چونکە مەعلومە ئەسلەکەی (کۆ) یە . حاجی قادر دەڵێ :

لەمەیـدانی بەهارا شـارەکەی کـۆ
قوبەی کشمیری دابەر شەق وەکو گۆ

لەفۆلکلۆردا هەیە دەڵێ .

« هەی گۆ گۆ گۆ دەچمە شاری کۆ دێنم دوَلیمۆ » .

(ی) لەچۆك کردنەوەشدا بەکاردێ . دەگوترێ (جـوجە ، جوجێلە ـ جـوانو ، جـوانێلە ـ جەوەندە ، جەوەندێلە . . .) . لەهەندێ ئاوایی و دێی ولاتی کۆیێدا بۆ خۆم لە توتنەوانم بیستوە گوتویەتی (ماشێلکە ، تەماتێلکە ، ترۆزێلکە ، شوتێلکە) . دونگی مەر کە لەگەل گۆشتی قاورمەدا سـوربۆوە پێی دەڵێن (چـزێلك)

کەبەلای منەوە وشەیێکی چۆك کرایەوە یە هەر چەند ئەسلەکەشـــی نەزانرێ . (پشیلە) ش چۆك کرایەوەی (پشیك) ە .

لە (عطف)دا دەچێتە پێش ئەمرازی (ش)ەوە دەگرترێ (ئەویش ، برامیش ، ترۆزێش ، دارو بەردیش) . بەلام رێ ئەوە هەیـە ئەگەر کۆتایی وشە پیتە بزوێنی ( ا ، ۆ ، وَ ، ێ ، ە ) بۆ ئەم (ی)یە بقرتێ وەیا بمێنێ . دەگوترێ (تۆیش ، تۆش ـ ئێمەیش ، ئێمەش ـ کایـش کاش ـ پێیش ، پێش ـ نۆستۆیش ، نۆستۆش) . هەلبـەت کە کۆتایی وشـــە (ی) وانە یێی تیژ بـۆ ئەم (ی)ەی عـەتف بەدیار ناکەوی لەقسەکردندا وەك دەلـێ (تروزێـــش ، برسـێش ، عەلێش ...) ئەوەش دەبێ بلێم (ی)ی عـــەتف هێـــزی (ی)ی ئیسمی مەعناو نیسبەتی نیە ، دیتمان لەمیسالاندا کە کەوتە دوای پیتە بزوێن بۆ خۆی لەبزوێنی دەکەوێو هیچ (ی)ی پەیوەندی نایێ بۆ پارێزێ ، سەررای ئەمە کەگوتمان رێ هەیە بۆ قرتانێشی .

لەهەندێ پێشگردا (ی)خۆ تێـکەڵ دەکا وەك (تێگەیشتن ، لێگرتن ، پێـگوتن) .

لەگەل وشەی (کرم)دا ئاوەڵ ناوێـکی تایبەتی پەیـــدا دەکا دەڵێ (دڵی کرمێبۆ ، مێوەکە کرمێبۆ) . بەلام لەگەل هەندی وشە (کەژ ، نەرم ، گوڵ) ناو پەیـــدا دەکا بـــۆ ئافرەت دەگوترێ (کەژێ ، نەرمێ ، گوڵێ ، شەمێ) .

(ی) بەشدار دەبـێ لە پێك هێنانی چوار ئەمراز یەکیان بـۆ هانْدان (دەي بـێ کوژە) . دوەمیان بۆ سەیرپی‌هاتن [ تعجـــب ]

دەگوتری (وەی چەند خـــۆشە). سێیەمیان بۆ ناڕەزایتی (هـەی بێوەفا). چوارەمیان بۆ بانگکردن (ئەی جیهان ، ئەی نیشتمان). وشەی (کەی) هەرچەند لەکێشی ئەم چوار ئەمرازە یە بەلام ناوی پرسیارەو ئەمرازنیە لەبەر ئەمە (ی)کەی پێتی ئیمـــلایە وەك (ی) هۆشیار ، سلێمانتی ، چێشتن ، مەی .

(ی) دەچێتە دوای چەند وشەیێکی وەك (شـــەو ، رۆژ ، سـبەینە) کەپێیـان دەگوترێ (نـاوی زەرف) دەیان کا بە زەرفو دەیانخاتە ریزی (دوێنیو پێرێ) کە زەرفنو هەر ئەم داڕشتنە شیان هەیە ، واتە وەك (شەو ، روژ ، چیشتە نگاو) نێن ئەساێکیان هەبـێو (ی)ی چۆبێتە دواوە . دەڵێی (رۆژێ دەگەڕێمو شەوێ دەنوم .. چیشتە نگاوی هاتەوە .. سبەینێ نامە دەنوسم). ئەم وشـانەو گەلێ وشەی دیکە وەك (نێوەڕۆ ، مەغریب ، عەسر ، عیشا ، نیوەشـەو ، بەهار ، هاوین ، پاییز ، زستان ، روژهەلات .) پێیان دەچێتە دواوەو دەیانکا بەزەرف..(نێوەڕۆیێ گەیشتم ـ مەغریبێ . عەسرێ .. رۆژهەلاتێ دەڕۆم ، نێوەشەوێ تێزخەوەدەبم ، هاوینێ .. بەهارێ دەچمەکێو ... هتاد) . وادەزانم (ی) دوای وشەی (بەیانی) پێی نیسـبەتە کەچی زەرفێتی دروستکردوە چونکە مانای (سبەینێ) یە بێزیادو کەم . وەك وشەی (بەیانتی) وشەکانی (شەوەکیو رۆژەکیو پێشەکیو پاشەکی)ش هەر بەهۆی (ی) نیسبەتەوە بۆن بەزەرف .

دێسانەوە دەبێ بڵێم ســـروشتی نەرمو شـلی (ی) وای کردوە بەشداربێ لەپیك هاتنی کومـەڵێك وشـەی دوێینتی وەك | تێ (بـۆ

تصدیق ) ، بێ ، بێ شەرم ، بێ ( مێوەی بێ کە کورت کراوەی بەهێ‌یە ) ، بێ ( دار بێ ) ، پێ ، تێ ( تێگرتن ) ، تێ ( کەوتەسەرتێ ) جێ ، چێ ( چێ‌کردن ) چێ ، خێ (بە مانای خوێ ) ] پێویست نیە من هەمو وشەکان بکەمە لیستەو جێگەیان پێ بگرمەوە . خوێنەر دەزانێ بۆ خۆی بە دوا ژماردنیان بکەوێ ، هێندە هەیە دەبێ کومەڵێك لە ناوی پیتی ( هجا )ش بخاتە سەرلیستەکە چونکە ئەمانیش زۆریان لە کوردیدا ناوەکەیان دوپیتی‌یەو کۆتایی‌یان (ی) یە وەك ( بێ ، تێ ، رێ ، زێ ، ژی . . هتاد ) .

بەلامەوە نازکی پیتی (ی) بوە بە مانیع لەوەدا بە دەگمەن نەبێ نەیێتە سەرەتای وشەوە ، چونکە پیتی نازك و نەرم و شل لەوە دەوەشێتەوە دەوری پەیوەندی ببینێ لە میانی پیتانزدا ، هاتنی لەسەرەتای وشەدا ئەم دەورەی لێ‌دەسەنێتەوە : سەیرکە لە کاتێکدا کە پیتی ( ی ) لە ناو رستە و وشەدا دەنگدارێش بێ ( واتە بزوێن نەبێ ) دیتسان تا رادەیێك دەوری پەیوەندی دەبینێ وەك دەڵێی (رای‌کرد ، مەی‌خۆ..) .

لێرەدا باسەکەمان کۆتایی دێ هەرچەند نەگەیشتومە کۆتایی مەوزوع چونکە بێ‌گومان جۆری بەکارهێنانی (ی) لەوەندەی خستمە روو زیاترە ، گەلێك لە سەرە باسەکانیشی پێویستی بە شتی‌کردنەوەی زیاتر هەیە . تا کە یەك میسال دێنمەوە وەك نمونە بۆ ئەو هەڵبواردنانەی لە ترسی درێژەی وەرسکەر کەلەبەریان خستوتە نوسینەکە ، بەلکی لەهەلی ئایندە دا من پڕیان کەمەوە یاخود نوسەری دیکە لێیان بدوێن ؛ میسالەکە ئەمەیە :

لە لیستەی ئەو فیعلانەی ( انتقال )یان تێدایە فیعلی ( ئۆڕژێن ) سروشتێکی تایبەتی هەیە کە لە شـوێنی خۆیدا لێی نەدوام وەك لە زۆر شتی دیکەی ئەوتۆیتی نەدواوم . ئۆڕژین فیعلێکە هـەم تێپەڕ هـەم تێنەپەڕ . فیعلێکی ( دوَ سروشتی ) یە . مومکینە ئۆڕژێن بە مانای ( دیتن ) بێ کە فیعلێکی تێپەڕە مومکینیشە بەو مانایە بێ کە فیعلی ( نظر )ەی عەرەبی رای دەگەیێنی و بە هۆی ( حرفی جر ) دەکرێ بە تێپەڕ دەنا بۆ خوێ لە ئەسلدا تێنەپەڕە . دەگوترێ ( خانوەکەم نوڕیَ ) کە لێرەدا فیعلەکە تێپەڕە وەك ئەوەیە بڵێی ( گۆشتم خوارد ، خانوەکەم دیت ) . دەشگوترێ (ئۆڕژێم کەسم نەدیت ) کە ماناکەی تێنەپەڕە وەك ئەوەی کە بڵێی ( رۆیشتم تا ماندوَ بوَم ، تەماشام کرد نەم دۆزیەوە ) . هەر ئەم دوَ ( سروشتی ) یە وای کردوە کە وەك فیعلی ( انتقالی ) بەکار دێ یەك ( مفعول )ی دەوێ واتە دەبێتە فیعلێکی تێنەپەڕ ( چونکە گوتمان فیعلی تێپەڕ لە حالی « انتقالی »دا دوَ « مفعول »ی دەوێ ) کەچی لە ( تصریف ) دا وەك فیعلی تێپەڕ ( تصریف ) دەکرێ . دەڵێی ( کردمان ، خواردمان ، ئۆڕژیمان ) . ئەگەر تێنەپەڕبا دەبوا بچێتە ریزی فیعلەکانی تێنەپەڕ لە ( تصریف )دا وەك ( رویشتین ، وەستاین ، فڕین ) ئەویش ببێتە ( ئۆڕژین نەك ئۆڕژیمان ) . سەیرێکی زۆر سـەیرتر ئەوەیە کە بە مانای تێنەپەڕیش بەکاربێ لە ( تصریف ) دا هەر وەك تێپـەڕ ( تصریف ) دەکرێ . دەڵێی ( ئۆڕژیمان کەسمان نەدیت ، ئۆڕژیمانێ ) کە ماناکەی تێنەپەڕە .

لە راستیدا مەبەسی بنچێنـەیی ئەم باسە کردنەوەی دەرگایەکی

نەکراوەیە لە زمانەکەمانزدا زیاتر لەوە ژماردن و دەورە لێدانی تەواوبێ وەك زەوی بەیار کە پانایی و درێژایی بێ‌سەرو بن بێ لە هەوەڵەوە یەك گاسنی لێ دەدرێ بەدوای ئەو شۆبڕینەدا وەرد دەدرێتەوە و دەکرێ بە دوو گاسن و سێ گاسن .. زمانی کوردیش هێشتا کەمێکی نەبێ نەبۆە بە کێڵگەی قەڵەم ، بۆیە عوزری نوسەر لە پەلەکردن و ماوەبڕینی خێرا وەك عوزری ئەو جوتیارە چالاکەیە دەیەوێ لە پێشەوە هەمو زەویەکەی شۆ ببڕێ نەکا بتورە و بەیاری تێدا بمێنتەوە .

وابوە وشەیێکی عەرەبیم لە جێگەیێکدا بەکار هێناوە ، لە شوێنێکی دیکەدا کوردیەکەم نوسیوە ، هەرچەند ئەمە کارێکی زۆر ئەدیبانەو پەسندیش نیە بەڵام بۆ خۆم چاوی لێدەپۆشم چونکە (تێگەیاندن) بەلای منەوە لە پێش مەبەسی ئارایش و (کوردیەتی)یەوە دێ . هۆیەکی دیکەش هەیە بۆ ئەوە بێ پەروابم لە بەکار هێنانی وشەی بێگانە کە لەبەر گوێیان ئاشنابوبێ : (حساسیة)م نیە دژی ئەو تەرزە وشانە . نامەوێ لە تورکێك یا فارسێك یا ئەفغانێك زیاتر کۆمە بکەم لە دەربڕینی واتا بە هۆی وشەی رێك و پێکی بێگانە کە واتای تەواو بەدەستەوە دەدەن . تەنها فەرقێك رەچاو دەکەم ئەویش ئەوەیە چونکە کوردی تازە بەتازە پێی دەنوسرێ پێویستی زیاترە لە تورکی و فارسی بە ئاشناکردنی وشە نوێیەکانی لەبەر چاوو گوێی خوێنەری کوردی . دەستیشم نەپاراستوە لەوە جارێکیان وشەی عەرەبیم بە ئیملای کوردی نوسیبێ وجارێکیان بە ئیملای عەرەبی . واش بوە وشەی کوردیم بە دوو جۆرە ئیملا

نوسيوه ، چونكه تا ئيستا بڕيارێك نه‌دراوه جورێكى تايبه‌تى رێنوس ببێ به ده‌ستور . كه حاڵيش وابێ په‌نجه‌و قه‌ڵه‌م ناوناوه رێ گۆڕكێ ده‌كه‌ن .

كه سۆزو راستى خوازى رابه‌رى نوسه‌ر بێ هه‌ر چۆنێك ده‌نوسێ با بنوسێ تا ئه‌و رۆژه‌ى شه‌قامێكى ئاشكرا قه‌رار داده‌كرێ .

كه جێگه‌ت بۆ عيباده‌ت بێ چ ( فوقانى ) چ ( تحتانى )
كه ( حبت ) بۆ سيياده‌ت بێ چ به‌رزنجى چ باراوى

* * * * *

# بەشی دوەم

# سۆزێکی خامە بە دەوری «زاناو»دا

زانایانی زمان تەواوێك خەریك بوون ، لەکۆڵینەوە ، پتریش خەریك دەبن لەدوا ڕۆژدا ، بۆ دۆزینەوەی بەشەکانی ئاخاوتن بەپێی سروشتی وشە و ئەو ڕۆڵەی پێی هەڵدەستێ لە ڕستەدا . یەکێك بیەوێ زیهن کارێ بکا و دەسەڵاتی زمانزانیش یارمەتی بدا دەتوانێ ، بابی قەناعەتی خۆی و بەشێکیش لە خەڵق ، بەڵگە بێنێتەوە بۆ ئەو دابەش کردنەی کە خۆی پەسندی دەکا چونکە بابەتی وەك ئاخاوتن کە بونێکی مادی نیە بیکا بە مەوزوعی ئەزمونی[1] « مختبری » و ڕاستی و هەڵەی بە تەجرەبە ساغ بکرێتەوە ، هەڵدەگرێ هەریەك لە سەرە باسەکانی چەندین بیر و باوەڕی جیاجیا لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە و هەمتوشیان شانازی بکەن و بە خۆیاندا هەڵبلێین . کە ئەمە دەڵێم ئاگاداری هێندێم بیر و باوەڕی خۆیشم ، کە هەبێ ، یەکێکە لەو شانازی کەرانە و بەخۆدا هەڵگوتوانە و هەر لە هەمان ڕێبازی یەکجار فراوانی زمانزانیەوە

---

(١) ئەزمون : امتحان .

یەکێکی وەك من دەرفەتی دەبێ لە کنارێکەوە هەنگاو هەڵێنێ و خۆ بترنجێنێتە ریز و کۆڕی بلیمەت و پسپۆڕ و ئوستادانی ئـەم بەشە گرنگەی زانستی مرۆڤ .

لە رواڵەتدا زمانیش هـەر بەقەدەر دیمەنە بـەر چاو و ئاشـکراکانی تری جیهان دەروَنی دەکاتەوە بۆ سرنج و تیۆەڕامان : خەیاڵێکی سەر پێ‌پی دەڵێ ئەستێرە و مانگ و رۆژ وا لە چاوان دەچەقن لە هەڵاتن و ئاوا بوَن و خوار و ژوَر کردنیاندا .. گیا و گەڵای دەشت و دەر لەبەر هەستی پەنجەکانمانـدا دەردێن و گەشـە دەکەن و وشك دەبن .. شاخ و گرد و تەلان و هەڵدێر و ئاو و ئاگر و ئاژەڵ کەرستەی گوزەرانی رۆژانەمانن .. هیچ کامێکیان پەردەی نهێنی لە خۆی نەئاڵاندوە و بە قـەدەر ئەلف و بێی ئاخاوتنمان ، لەوانیش زیاتر ، دێنە بەر پینج هەستەی ئادەمزاد : کەواتە زانستی زمانیش یەکێکە لەو زانستانەی سـەرچاوەکانیان روَنە و لە دیمەنی ئاشکراوە «انعکاس» دەکەنەوە بـۆ بەر هەست و زیهنی مرۆڤ ، هێندەی وانیش پێویستی هەیە ، یا نیە ، بە فێرکار و مامۆستا بـۆ لێ شارەزابوَنی .

ئەم خەیاڵە سەرپێ‌پی‌یە فزی بەسەر راستییەوە نیە :

ئاخاوتن سـەرەڕای ئـەوە کە بەرهەمێکی هەسـت پێ‌کراوی بێ‌پەردە و ئاشکرای مرۆڤە ، زادەی ئیرادە و خواهیشت و هۆشی مرۆڤیشە ، بابڵێم دەسکردی هۆشیەتی .. مەخـلوَقی زیهنیەتی . مرۆڤ نازانێ چۆن دەبینێ و دەچێژێ و دەبیسێ و دڵی لێ‌دەدا و

زراوی کاردەکاو مۆی درێژ دەبێ و ددانی دەکەوێ .. بەڵام دەزانێ
چ دەڵێ و بۆ چی دەڵێ .. دیتن و چێشتن و بیستن و دڵ لێدان و
ددان روان و کەوتن دەسکردی مرۆڤ نین ، کاری سروشتن لە
مرۆڤدا و لە غەیری مرۆڤیشدا ، بەڵام ئاخافتن هەمۆ پیت و وشە و
ئەمراز و رستە و تێكهەڵکێشان و دارشتن و کورت کردنەوە و
درێژە پێدانێکی کوتومت خەلقی خواهشت و ویستی مرۆڤە ،
زەنەی هەست و بیریەتی . دارتاش کە تەختێك دەکا دار و بزمار و
مشار و لۆکە و قوماشەکە لە لاوە دێنێ و دەیانکا بە تەخت ، بەڵام
هەمان دارتاش کە قسە دەکا سەر لەبەری ئاخاوتنەکەی لە دەروَنی
خۆیەوە دروست دەکا ، لە نەبۆنەوە دەیهێنێتە بۆن : دەروَنی
دارتاش سەرچاوەی ئاخاوتنە زیاتر لەوەی کانی سەرچاوەی ئاو بێ
چونکی ئاوی کانی مەخلوقی کانیەکە خۆی نیە ، بەڵام
ئاخاوتن مەخلوقی دەروَنەکە خۆیەتی . تەنانەت بەرهەمی
هونەرمەندیش ، وەك رەسم و پەیکەر تراشی و مۆسیقا ، بەقەدەر
ئاخاوتن مەخلوقی هونەرمەندەکە نیە چونکە کەرستەی بەرهەم هێنانی
هونەر لە رەنگ و فرچە و مەڕمەڕ و کەمان و عۆد زادەو مەخلوقی
هونەرمەند نین . قیاسی بەرهەمی هونەرێ لە ئاخاوتن ناکرێ ،
چونکە ئەو بەرهەمانە لەتەك ئاخاوتندا زۆر بێگانە خۆ دەنوێنن
بەنیسبەت مرۆڤەوە : قیاسیان لەگەڵ « نوسین » دەکرێ لەو رودوە
کە خامەو مەرەکەب و کاغەزیش وەك کەرستەی بەرهەمی هونەرێ شتێ
لاوەکێ و دەرەکین بە نیسبەت دەروَنی مرۆڤ کە کارگەی
ئاخاوتنە .

ئەم نیسبەت و پەیوەندییە یەکجار نێزیکەی میـانی مـرۆڤ و زمان کە نیسبەتی خەلق و داهێنان و هەڵقوڵین و زەنـە کـردنە ، وادەکا کە زمانزان لە خەریك بونی بە زانـتی زمانەوە وەك خەریك بێ بە دەسکردێکی ئاشکرا و مفهومی خـــۆیەوە وایە ، هێندەی کە خوێندنەوەی کتێب و نوسراو و تیۆریەکانی سەر بە زمان یاریدەی دەدەن بۆ قوڵ بونەوە لەم زانستەدا ، زیاتریش لەو ، وردبونەوە و سرنج گرتن و بەراورد کردن لە خودی زمانەکە ، کە تەرجومـانی دەروونی خۆیەتی ، رۆشنایتی بۆ هەڵدەکەن و تـرکیبی زمانەکەی بـۆ ئاشکرا دەکەن وەك ئەوەی لەبەریەك هەڵوەشابێ و گرێ و گاڵ و تەگەرەکانی کردبێتەوە و نهێنیەکانی رەواندبێتەوە .

ئەم تێبینیانە دوو ئەنجامی گرنگ بە دەستەوە دەدەن :

یەکەم : زمانزان رێی ئەوەی نیە دەم لە زمانێـکی بێـگانە بدا تا بـە رادەی زمانی مادەرزادی خۆی لێی شارەزا دەبـێ . فێربـونی « رسمی » و دەرس خوێندن لە زمانێـکدا مرۆڤ ناکا بە شیرەژی ئەو زمانە . بۆ کوردێك کە عەرەبی یا ئینگلیزی فێـر دەبێ ئەوەندە بەس نیە لە رێی فێربونەوە بزانێ عەرەب و ئینگلیز کار «فعل» پێشی بەرکار «مفعول» دەخەن و دەڵێن « أرى رجـلاً ، I see a man » و وەك کورد ناڵێن « پیاوێـك دەبینم » و بـەرکارەکە پێش بخـەن . . تا کوردێك مافی ئەوەی دەبێ دەم لە رێزمان و تایبەتیەکانی عەرەبی و ئینگلیزی بدا ، پێویستە وەك ئینگلیزێك و عەرەبێـك پێش خسـتنی بەرکاری لێ بپێتە سەلیقەی لە بیری بچێتەوە کە لەو پێش خستنـەدا

دژی سەلیقەی کورد رەفتار دەکا . گەورەترین هەڵەیێکی شاگردی زمان بیکا ئەوەیە دەرس لای ماموستایێك بخوێنێ کەوا هەر بابی ئەرکی سەر شانی زانایێکی ئەکادیمی شارەزای ئەو زمانەبێ کە بە دەرسی دەڵێتەوە . زمان هەر کار و کارا و بەرکار و تێپەڕیو و داهاتو و وشە و ئەمراز ... نیە ، شیرازە و تەقەڵ و درومانێك کە ئەمانە بە یەکەوە دەبەستێتەوە ، گیان و هەست و هۆش و سلیقەی مرۆڤ خۆیەتی . بەرەو ژوری مێژو بۆ زمانەکەت سەرکەویت ، جوڵەی مێشك و خورپەی هەناو و سۆزی دڵ و تاسەی گیانی باپیرەکانتی تێدا دەدۆزیەوە کە ئێستاکە خۆت بێ ماموستا و دوَر لە لاسایی ، بە سەلیقە دوَبارەیان دەکەیتەوە بێ ئەوە توانیبێتت فکر بکەیەوە لە سەرچاوەکانیان . زمانزانێکی بێگانە لە فەرزی بە دەرسیش ئەو مێژوە بخوێنێ ، لە تاکە رێی مێشکەوە فێری دەبێ و لە تاکە رێی زمانەوە دەیداتەوە ، مەگەر بۆی بلوێ وەك تۆ تێیدا بکوڵێ و فرچکی زانایانەی پێوە بگرێ . بەداخەوە ، دیومە ماموستای زمانی کوردێ لە رێی فێرکاری[2] بێگانەوە چۆتە ناو زمانەکەیەوە و رێزمانێکی تەرجەمە کراوی بە دەرس وەر گرتوە و دەیەوێ بیکا بە کلیل ، راستی و نهێنیەکانی زمانی کوردێ پێ بکاتەوە . چەندین جار لە وتوویێژدا دوَچاری دڵ گەرمی بووم لە وەدا کە دەبینیم رۆشنبیرێکی کورد لە موناقەشەی پرسیارێکی زمانی کوردێ بە ئاسایی و بێ پەروا بنیشتۆکەی « کوردی لە زمانەکانی هیندێ - ئەوروپایی‌یە »ی .

---

(۲) فێرکار : معلم .

جێواوەتەوە بە جۆرێـك هـەر دەڵێی بیری نەکردۆتەوە لەوە کە کوێی و پژدەر و دیاربەکر و هەورامان و شکاك و قامیشلیش کوردن، نەك هەر (هیندی ـ ئەوروپایین) کەچی زۆر جار ئاخاوتنیـان لە یەکدی دوور دەکەوێتەوە .

دوەم : زمانزانانی زمانێك ، کە خۆشیان رزگار بکەن لە تاو و تەئسیری زمانێـکی بێـگانە و بە مێشکێکی ئازاد و کرایـەوە دەست بکەن بە تۆژینەوە لە رێزمان و تایبەتیەکانی زمانـەکەیان ، لە وانەن بە رێبازی جیاجیادا بڕۆن بۆ بنج و بناوانی باسەکانیان و ماوەی فراوان لە یەکدی بترازێن بێ ئـەوەی یەکێـکیان جارێ چۆبێتە ناو سنووری هەلە . زمانەوان زانایێـکی کیمیا نیـە ، کە هەلەی نەکردبێ ، هەر بگا بە تاکە ئەنجامێکی راست لە تحلیلی ئاوو با و خاك : زمان لە دەروونی خەڵقـەوە هەڵقوڵیوە بـە سـەر شەقامێـکی هەزاران ساڵەی مێژوودا ، لەوانەیـە گـەلێـك لـە دەستوورەکانی تێکەڵ بوون و بەیەك گەیشتنەوەی چەنـد لەهجەیێك پەیدای کردبێ ، یاخود لە ئەنجامی دابەش بوونی شەقامە رێیێکی زمان بۆ چەند رێچکۆلەیێك ئەو دەستوورانە بەرهەم هاتبن ، بەو پێیە دەشێ «اجتهاد» ی زمانزانێك بیگەیێنێ بە رێچکۆلەیێك کە دراوسێی ئەو رێچکۆلەیە بێ زمانزانێکی تر پێی گەییوە . بە نموونە دەڵێم جارێکیان لە وتووێژی میانی ئەندامانی لیژنەی رێنووس دەربارەی هەنـدێ لە گیروگرفتەکان [من گوتم ئەو پیتە « د »ەی کە لەهەندێ لەهجـەی کوردیدا دێتە میانی پیتی « ژ »ی ئەسـڵی وشە و « ر »ی صیغەی « بنا مجهول » ەوە بـۆ مەبەستی سوك کردنی « تلفظ »ی هەردوو

« ر »ەکەیە ، وەك دەگوترێ «کزدرا ، گۆزدرا » . گوتم ئــەو « د »ە وەك « نون الوقایە » ی زمانی عەرەبی وایە بە زیادەوە دێ بۆ مەبەستێکی تایبەتی . یەکێك لە ئەندامان بۆ ئەو باوەڕە چــو کەئەم « د »ە هەمان پیتی رەسەنی « کزیدن و گۆزیدن »ە لەم حاڵەی بە یەك گەیشتنەوەی دوَ « ر » دەگەڕێتەوە بۆ ناو ئاخاوتن ، کەواتە بە زیادەوە نەهاتوە وەك « نون الوقایە ». راستی هەر کامیان بــێ ، یا شتێکی تر بێ غەیری ئەم دوَ «احتمالە» ، زمانەوان و زمانزان لێی بە عەیب ناگیرێ ، بۆ تەعلیلی زاهیرەیێکی زمانەکەی ، یـەکێك لەو رێبازانەی پەسند کردبێ کە ددەست دەدەن بۆ «تعلیل» و لە راستە شەقامەکانی زمانیشیان لا نەداوە ، بە تایبەتی بــە نیسبەت زمانی کوردییەوە کە تۆژینەوە و پشکنینەوە و تەقــەلای دۆزینــەوەی دەستورەکانی ، جارێ ،کاری سەرەتایین و نەگەیون بە پلەی سەپاندن .

چاوەڕوان دەکرێ لە حاڵی ئێستا کەماندا زمانـزانی کوردی ، کە خۆی کورد بێ ، یا لە رێـی لاســایی کردنەوەی بێـگانە ، کە بە کارێکی نارەوای دەزانم ، یا بەهۆی سرنج گـرتن و «استقرا» ی خۆیەوە رێی ئەوتۆ بگرێتە بەر بۆ دانانی رێزمان ( راستییەکەی دەبێ بڵێین دۆزینەوەی رێــزمان ) زۆر و کەم جیاواز بــێ لە رێـی زمانزانێکی تر و بکا بە ئەنجامی سەربەخۆی خۆی لە بیرکردنەوە و پێوانە و کێشانەی زمانەوانی . بە لای منەوە هەر هەولێکی تایبەتی نهێنیەکی زمانەکەمان ئاشکرا بکا و دەستورێکی روَن کاتەوە هەولێکی پیرۆز و بایەخدارە ، ئـەو رێـگایە چ دەبێ با ببێ کە تەقەلــلاکە بەسەریدا

گوزەری کردوە . گریمان تێکڕای شێوازی کارکردنێك لەسەر ڕێبازی زانستی تازەش نەڕۆیی بێ ، دۆزینەوەی دەستوری ڕاست لە بەکارهێنانی ئەو شێوازە ناتەواوە نرخی کەم نابێتەوە . هەڵەی پەیڕەوی کردنی شێوازی ڕاستیش هەر بە هەڵە لە قەڵەم دەدرێ ، و دروستی شێواز شەفاعەتی بۆ ناکا .

ئەم جۆرە بیر کردنەوە بۆ هەندێمان دەبا کە سەیرمان نەیێتەوە لە زۆر بوونی بیر و باوەڕی جیا جیا هەم لای زمانزانانی جیهان دەربارەی تێکڕای زانستی زمان و سەرجوملەی زمانەکانی گەلان هەم لای زمانزانانی تاکە زمانێك لە عاست سروشت و ڕێزمان و تایبەتیەکانی ئەو تاکە زمانەدا . بەولای سەیر پێی نەهاتن ، بۆ ئەوەمان دەبا کە لەو حاڵە نارازیش نەبین و ئەگەر بە زیهنێکی فراوان سەیری دیمەنەکە بکەین خۆش ئامەدیش بکەین لە زۆریی شێواز و جۆری تێفکرین لە زانستی زماندا ، چونکە بێ گومان هەر زانایە لە ئەنجامی هەست و تصورێکی سەربەخۆی خۆیەوە شێوازێکی سەربەخۆی گرتۆتە بەر ، دەشێ بەرهەمێکی ئەوتۆ بە دەستەوە بدا لەو شێوازەوە نەبێ دەست نەکەوێ . ئەگەر لە نێو سێ چوار هەڵە ڕاستییێکمان پێ ببەخشێ زۆرمان قازانج کردوە .

چ لە تێکڕای زانستی زمان بێ ، چ لە تاکە سەرەباسی « بەشەکانی ئاخاوتن » بێ بیر و باوەڕ و لێکدانەوەی زمانزانان بەراوێزی خۆی فراوان کردوە و ژمارەی بەشەکانیش تێهەڵکشاوە ، وا پێدەچێ هەر لە فراوان بوون و تێهەڵکشانیش بێ تا ماوەیێکی

نادیاری دوا رۆژ .

به نیسبەت « بەشەکانی ئاخاوتن »ەوە ئـــەو دابەش کردنانەی لەلایەن زمانزانانی کوردەوە بە زۆری لە کارهاتون ، سێ بەشـەکەی عەرەبێ « اسم و فعل و حرف » و هەشـــت بەشەکەی ئینگلیزێ « ناو و رانــــاو و ئاوەڵناو و کار و ئاوەڵـکار و Preposition و ئەمرازی پەیوەندێ و Interjection » ن .

ئەو کوردانەی لە بابەت رێزمانی کوردییەوە نوسیبێتیان ، بەپێی سەرچاوەی سەقافەتیان پەیڕەوێ عەرەبێ یا ئینگلیزییان[۳] کـردوە ؛ نوسەری کورد هەیە هەر ئەو سێ بەشـەی عەرەبێ کردوە بە بنجی نوسینەکەی و بەوەدا « راناو ـ ضمیر »ی کردوە بە بەشێکی « ناو ـ اسم » ، ئەو دەورەیشی داوە بە « راناو ـ ضمیر» لە پێكهێنانی واتا و دارشتنی رستە لە کوردیدا کە زمانزانانی عەرەب بـۆیان داناوە . تاقمێکیتر لە زمانزانانی کورد کە پەیڕەوێ رۆژئاوایان کردوە « ضمیر راناو » یان داناوە بە یەکێك لە بەشەکانی ئاخاوتن ، بەڵام هەروەك لە زاراوەکەی «رانـاو ـ Pronoun »را دەردەکەوێ ئەو کوردانـەش وەك زمانزانانی ئەوروپا «راناو»یان بە سێبەرێـکی «ناو» زانیوە و بە جۆرێك لە سەربەخۆیەتییان کەم کردۆتەوە کەلـکی ئەوەیان پێـــوە نەهێشتوە ئەو دەورە زلەی هەبێ کە لە ئاخاوتنی کوردیدا بە راستی هەیەتی ؛ وردە وردە لەگەڵ رچەی نوسینەکەم ئـەم راستییەت بۆ رۆن دەکەمەوە ، وەك خۆم لە « راناو » و دەوری یەکجار گەورەی

---

(۳) چاکتر ئەوەیە بڵێین «ئەوروپایێ » .

لە ئاخاوتنی کوردیدا ڕێکەیشتوم .

بەپێڕەوانی زمانی عەرەبێ لە کوردیشدا هەر بە «ضمیر» ناوی ئەم بەشەی ئاخاوتنیان بردوە ، ئەو چەند وشەشیان بە « ضمیر » داناوە کە لە عەرەبیدا «ضمیر»ن .

شاگردانی فێرگەکانی[٤] ئەوروپاش ، وەك ئەوروپاییەکان راستەوخۆ « Pronoun »یان وەرگێڕاوەتە سەر کوردێ ، هەندێکیان پێی دەڵێن « بۆناو » هەندێکیان «جێناو » هەندێکیشیان « راناو »یان بۆ کردوە بە زاراوە . ئەم وشەیەی دوایێ لەنێو کوردستانی خوارووَدا باوی ستاندوە و زوربەی نوسەران بۆ « ضمیر ، Pronoun » بەکاری دێنن ، منیش کوردێ گوتەنی « بەگوێی مامۆستا » کردوَمە بە سەرەباسی ئەم گوتارە . هەر لەم ڕێبازەی چاولێکەرێ زاناکانی ئەوروپاوە نوسەرەکانمان هەمێ ئەو وشانەیان بە « راناو » لە قەڵەم داوە کە لە زمانەکانی ئەوروپادا پێیان دەڵێن « راناو » و بەر ئەو « تعریف » ە دەکەون کە بۆ راناویان هەڵبەستوە .

تۆ بڵێی « راناو ، ضمیر ، Pronoun » لە کوردیدا هەر ئەوە بێ کە عەرەبێ بۆ خۆی بە « ضمیر »ی داناوە ؟ ، یاخود راستە « Pronnou » کە پێی بڵێین « راناو » ئەوەندە فراوان و بێسنوور بێ کە ئەوروپاییەکان جغزیان بۆ پان کردۆتەوە ؟ ئایا سروشتی زمانی کوردێ و سەلیقەی قسەکەری کورد دەسەڵمێنێ بەو وشانەی پێیان دەگوترێ « راناوی لکاو » لە کوردیدا ئەو واتایە راگەیەندرێ کە

(٤) فێرگە : مدرسە .

« is ، am ، are » له ئینگلیزیدا رای‌ده‌گه‌یه‌نن ؟ .

چت لێ بشێرمه‌وه ، رۆشنبیری کورد ، به‌دبه‌ختانه نه‌متوانیوه له‌گه‌ڵ یه‌کێك له خاوه‌ن بیر و رایانی کورد بگونجێم له‌سـه‌ر پاکی باسی « راناو ، ضمیر ، Pronoun » بگره هه‌ر له سه‌ره‌تاوه رازی نیم به زاراوه‌ی « راناو ، بۆ ناو ، جێ‌ناو ، به‌رناو » که جۆرێکن له وه‌رگێڕانی وشه‌ی « Pronoun » بۆ سه‌ر زمانی کوردی . خۆ دابڕینی زاراوه‌ی « ضمیر » به‌سه‌ر ئه‌م به‌شه‌ی ئاخاوتن ، که تصوری زانایێکی عه‌ره‌ب ده‌داته‌وه بۆ ناو رێزمانی کوردیی نه زمانه‌که‌مان لێمان ده‌سه‌لمێنێ و نه هیچ لایه‌نێکی باسه‌که روون ده‌کاته‌وه . که رێمان ببێ «ضمیر» به‌کار بێنین ، بۆ نه‌ڵێین «بارز ، واضح ، معلن» چونکه ئه‌و واتایه‌ی «إضمار» که عه‌ره‌ب هه‌ستی پێ ده‌کا له سروشت و ده‌وری «ضمیر» ی عه‌ره‌بی ، ده‌بێ کوردێك دژی ئه‌و هه‌ست پێ بکا که سرنج بگرێ له «ضمیر ، راناو » له ئـاخاوتنی کوردیدا له‌و روه‌وه که رسته‌ی واتاداری خاوه‌ن «إسناد ، حکم» له کوردیدا دروسـت نابێ بێ « ضمیر ، راناو » . به‌شێکی یه‌کجار که‌م نه‌بێ له رسته‌ی کاردار «جملة فعلية » له کوردیدا ، هه‌رچی ئاخاوتن هه‌یه بێ «راناوی لکاو » نابێته رسته‌ی ته‌واو .

که خۆمان ئازاد که‌ین له لاسایی کردنه‌وه و ره‌ها بین له تاوی بیرو باوه‌ڕی حازر و بزری زمانزانه ناوداره‌کان و سـرنج بگرین لـه سروشتی زمانه‌که‌مان وه‌ك هه‌یه ، نه‌ك وه‌ك له ئاوێنه‌ی رێزمانی بێگانه‌دا ده‌یبینین ، بایی لێ‌وه‌شانه‌وه‌ی باسه‌که‌ش به‌شـه جـوداکانی

ئاخاوتن هەڵسەنگێنین و بە یەکدییان بگرین ، بۆ زیهنی ڕوون و کرایەوەمان دەردەکەوێ ئەو تاقمە وشەی کــە لە زمانەکەماندا دەبنە «ڕاناوی لکاو » بەشـێکی هێندە بنجی و سەربەخۆن لە ئاخاوتندا و دەورێکی وەها بێ هاوتا بێ هەڵدەستن لە داڕشتنی ڕستەی تەواودا کە هەرگیز نەشێ بە بیرماندا بێ ئەو وشانە بکرێن بە سێبەری هیچ یەکێك لە بەشەکان ، چەندی گرنگ دەبێ ئەو بەشە با ببێ .

بۆ دەرخستنی دەوری لە غایەت بەدەر گرنگی ئەو تاقمە وشەیە لەوە تێفکرە کەوا ئیمکان هەیە رستەی تەواو پێك بێ لە کوردیدا بێ لە کارهێنانی ناو ، یاخود کار یا ئاوەڵکار ، یا هەر بەشـێکی تر بێ لە بەشەکانی ئاخاوتن ، بەڵام رستەی تەواوی « اسناد دار » بێ «ڕاناوی لکاو» پێك نایێ . ئەم کۆمەڵە نیمچە وشەیەی کە پێیان دەگوترێ « ڕاناوی لکاو » لە دروست کردنی ڕستەدا وەك داوە دەزوو وایە کە پارچەکانی قوماشێك بە یەکدیدا ددروێ و دەیانکا بە جل و بەرگ ، یا ئەو لەحیمەی وردە ئەمرازی مەعدەن بە یەکدییەوە دەبەستێتەوە و مەکینەی تەواویان لێ پێك دێنێ .

بۆخۆت لەگەڵ خۆتدا خەریکی گوتنەوەی گوتەی جۆر جۆری زمانەکەت بە و سرنج لە کەرت و بەشەکانی بگرە و بیانخە بەر تەرازوی « منطق » و هەست و زانینت .. وا منیش فکری خۆم لەگەڵ هی تۆ جووت دەکەم و رســتەی جودا جودا لێرە و لەوێ ، بێ ئامانج و مەبەستی دیار کراو ، بەسەر زماندا دێنم .... « وەی چ خۆشـــە سەرکەویت .. تا توانیم رۆیشتم .. بزۆن بۆ خۆتان بخولێنەوە .. تا

دەستی نەدا خەنجەری نەیفەرمق دەسا دەی .. چیە گوارە گوناهی وا بە نەستەق .. بە گوێی هەڵتاواسیوە سەر معلق ـ بەردەکان زلن .. ئێمە کوردین .. دوای حەسانەوە رۆیشتین .. » . تا رستەی واتاداری تەواو بێنینەوە راناوی لـکاو ، بە ناچارێ و بە دائیمی ، یەکێکە لە کەرتە بنجییەکانیان .. رەنگە « کار » لە رسـتە دەرنەکەوێ و واتاش تەواو بێ . وەك کار « ناو » و هەمو کەرتەکانی تری ئاخاوتنیش هەر وان ، تەنانەت راناوی نەلـکاویش هەمو جاران لە قسەدا دەرناکەوێ ، تاکە کەرتێـکی بێ بڕانەوە هەر راناوی لـکاوە .

دەوجا کە بەشێکی ئاخاوتن ئەوەبێ رستەی واتاداری تەواو بێ ئەو پێك نەیێ ، چۆن رەوایە تێکەڵ بەشێ‌تر بـــکرێ کە دەگونجێ هەبێ و نەبێ لە رستەدا ؟ ، ئەم جیاوازییە زلەی میانی رانـــاو و غەیری راناو کە نەبێتە هۆی جیاواز کردنەوە و هەڵاویردنی ، ئیتر لزوم چیە بەشەکانی‌تری ئاخاوتن لە یەکدی جیاواز بکرێنەوە و خۆمان بە لێ‌تۆژینەوەیان ماندوَ بکەین ؟ تا خەریك بین جیاوازێ بدۆزینەوە لە میانی ئاوەڵناو و ئاوەڵـکار « صفة و ظرف » ناگەین بە دەیێکی ئەو جیاوازییەی وا لە میانی راناوی لـکاوی « هەڵستاین » و وشەی دارا و باغ و مامزدا هەیە .

پەیڕەوانی فێرگەکانی ئەوروپا راناوی زمانی کـوردی دەکەنەوە بەو هێندە بەشـــەی کە لەو زمانانەدا بە راناو حیساب کراون . سەرجوملەی دابەش کردنەکەیان ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە :

١ــ راناوی کەسی Personal pronoun وەك : من ، ئێمە

تۆ ، ئێوە ، ئەو ، ئەوان لەگەڵ جوزی لکاویان کە جیاوازی تێدایە هەم لە کاری تێپەڕ و تێنەپەردا و هەم لە لەهجەیێکەوە بۆ لەهجەیێکی تری کوردی .

٢— راناوی لێــکدەر ، رابط ، گەیەنەر ، پێگەم ، پەیوەندی : لە ئینگلیزی Relative pronoun ، لە دەستوریێکی فارسی ( حرف ربط )ی پێ گوتراوە و ناوی تریشی هەیە غەیــری ئەمانە . وێنەی ئەم راناوە لەم رستەیەدا دیاردەکەوێ « ئەوەی کە دوێنێ هاتە لام بارام بو » . بەلای هــەندێ زمانزانانەوە هــەر « کە » یەکە راناوە ، بەلای هەندێــکیشەوە ئەو پیتە « ی » ی دوای یەکەم وشەی رستەکە ئەویش هەر راناوە .

٣— راناوی پرسیاری ، وەك : کــەی ، کام ، کوێ ، چۆن ، کوا ، بۆ ، چەند ، ئاخــۆ ، ئایا ، کامەتە ، کامەیــە ....

٤ـ راناوی ئیشاری وەك : ئەمــە ، ئــەوە ، ئــەمانە ، ئەوانە ، هۆوانە ، هۆ و هێ ...

٥— راناوی خۆیی وەك : خۆم ، خــۆت ، خــۆی ، خۆمان ...

٦— راناوی هەیی وەك : « هی من ، هی تــۆ ، هــی خۆمان » یاخود هین من هین تــۆ ، بەپێی لەکارهێنــانی ناوچەیی لە هەندێ شوێنی کوردستانی ژێروَدا ..

٧— راناوی نادیار هەندێك پێی‌دەڵێن بۆ ناوی « مبهم » ـ ناوی تریشی هەیە ، کە بگەڕێین بەدوا هەمتو جورە ناوەکانی .

ئەم راناوە ( نادیار ـ مبهم ) ەیان دابەش کردوە بۆ دوَ بـەش :

أ ـ راناوی نادیاری سادە ـ یاخود روَت وەك کەس ، کام ، پیاو ، چی ، هیچ ، کابرا ، فـلان ، هین ، هەمتو ، کەم ، یەك ، هەرامە ، وانێك ...

ب ـ راناوی نادیاری لێـکدراو وەك : هیچ کەس ، هینەکە ، کابراکە ، هـەر کابرایێ ، هەمتو کەس ، یەکێ‌تر ، گەلێ ، کەسێ ، نەختێ ، فلانەکەس ...

ئەم کۆمەڵە وشەیەی لەیەك نەچوَوی ، واتا جیاوازی ، خاوەن تایبەتی سـەربەخۆ لە رسـتەدا خراونەتـە ژێر ناو و عینـوانی راناو لەبەر هۆیێکی‌بنجی : گۆیا هـەر یەکێك لەمانە بگـرە لە وشەی «من» تا دەگاتە «فلانەکەس» جێگەی ناوێکیان گرتۆتەوە لە رستەدا و دەشێ وشەکە لابەیت و ناوێـك بخەیتە جێگاکەی ، واتە کە گوتت « کابرا هات» دەتوانی بڵێی « دارا هات » ، هەروەهاش ئەو وشانەی تر کە لە لیستەی سەرەوە بەدوا یەکتردا قەتارمان کردن هەمتویان ئەو قابلیەتەیان تێدایە کە ناو بخرێتە جێگایانەوە .

بێ‌گومان لە قەواڵەی گوتارێکدا مەودای موناقەشە و نرخاندنی هەر یەك لەوبەشانە و لەو وشانە پەیدا نابێ ، کە بمەوێ لەسەر هەمتویان بدوێم دەبێ نیمچە کتێبێکی لەسەر بنوسم ، کەواتە بیر و باوەڕ و

رەخنەیێکم کە هەبێ دەربارەی سەرپاکی باسەکە دەبێ بە جۆرێکی گشتی و لە گۆشەی نیگای تەصوری خۆمەوە بەرەو پیریان بچم، نەك مفرداتی لیستەکان خورد کەمەوە و هەر یەکەیان باوێمە ئەو پەراوێزە رێزمانیەوە کە بەپێی قەناعەتی خۆم پێی رەوا دەبینم. بە نمونە دەڵێم دەربارەی ئەو کەرتەی پێی گوترا «راناوی پرسیاری» سەرەڕای ئەوە کە من بە راناوی نازانم، مفرداتی کەرتەکەش بە چەند جۆرێك دادەنێم. وشەی «کێ» پرسیارە لەبارەی «کەس»ەوە: وشەی «ئایا» پرسینی «مطلقە» و ناچێتە ریزی «کێ و چەند و کەی»ەوە. «ئایا» ئەمرازی پرسینە و «کێ» ناوێکی رێك و پێکی سەربەخۆی واتا داری پرسینە. تعریفێك کە دانراوە بۆ «ناو» وشـــەی «کێ»ی بەردەکەوێ بەڵام وەك لاستیکیش لێکی بکێشیتەوە باوەش بە وشەی «ئایا»دا ناگرێ مەگەر بە زۆرە ملێ و کوتەکم حقی چن.. ئەوەی راستی بێ وشـــەی «ئایا، ئاخۆ، ئەرێ» هەر لە رێی ئەوەوە کە واتای پرسیاریان تێدایە دەترنجێنە ناو پەراوێزی «راناو»ەوە، دەنا ئـەگەر بەهـۆی بەشداربوونیان لە واتای پرســـیار نەبێ کە کۆیان دەکاتەوە لەگەڵ «راناوی پرسیاری» هەرچی پەیوەندی و خزمایەتی و نزیکی هەیە لەمیانی ئەمان و راناودا پەیـــدا نابێ، چونکە بە هیـچ زانـا و پسپۆڕ و پاڵەوانیش ناکرێ پێمان بسەلمێنێ ئیمکان هەیە ناوێك بخرێتە شوێنی «ئایا» لە رستەدا تا هەر نەبێ لە رواڵەتدا پێی بـگوترێ «راناو، جێ ناو، بۆ ناو، Pronoun». ئەگەر بە تەئویلێکی زۆر دوورە دەست زمانزانێك هەڵهانفریوێنێ بەوە کە (ئایا) دەست دەدا ناوێکی بخـــرێتە جـــێ، من لەئێســـتاوە پێشنیـار دەکەم

« هەلاو » یش بە راناو قبول بکرێ چونکە دەشێ بڵێین مەبەستمان لە وشەی هەلاو « مرۆڤی ئەوپەڕی تەلەکە »یە .

دەمەتەقە و موناقەشە لەسەر ئەو بیر و باوەڕەی « راناو »ی کردە « ٧ » جۆر و « م »ی وشەی « گرتم »ی لەگەڵ « فلانەکەس » لە ژێر یەك عینوانداکۆکردەوە و بە هەر دوَیانی گوت « راناو » نە سەری دیارە نە بن ، ئەوەندەی بە دوای کەوین و لێی بکۆڵینەوە و رەخنەی لێ بگرین بە بەریەوە هەیە . کە بهانەوێ دەتوانین بـــۆ ماوەیێکی دوَر و درێژ هەر بەردەوام بین لەسەر بەراوردکردنی « کە »ی رستەی « ئەو پیاوەی کە هات » لەگەڵ وشەی « خۆمان » یاخـــود وشەی « کابرا » یاخود « هین » و چەندین جار خـۆمان و خەلقیش ئیقناع کەین کە ئەمانە ناشێن هەمتویان بخرێنە ژێـر عینوانێکەوە و لەوەشڕا هەنگاوی‌تر هەڵێنین بۆ دەرخستنی نادروستی ئەو بیر و رایانە بە هۆی هێنانەوەی رستەی وەك « ئایا کە ئێوە هیچ خۆتان بۆمن نەبزێون بۆچتی من هتی ئێـــوە بم » کە بەپێی دابەش کردنـەکەی سەرەوە لە ١٥ کەرت ١٢ کەرتی راناوە !! خولاسە مەیدانی رەخنە بەر فرەوانەو بە پێی باوەڕی مـــن رەخنەکانیش زۆر بەهێزترن لەو بنگە فکرییانە کە زمانزانەکان بەلـگە و ئیسپاتیان لێ هەڵقولاندوە بۆ کۆکردنەوەی فەرهەنگۆکێکی وشەی لە یەکدی جودا لەژێـــر عینوانی « راناو » دا .

من کە عوزری بێمەودایتی دێنمـــەوە لە پەراوێزی گوتار ، ئەسەفێکی کەم ناخۆم بۆ ئەو بێمەودایی‌یە لەو رووەوە کە هەڵسووڕ و

داستۆزی فکر بەدەوری ئەو وشانەدا بەدەم سرنجدانێکی ورد و قوڵ لە سروشت و کونهی واتایان و دەوریان لە ئاخاوتندا ، بێ گومان ، گەشتێکی خۆش و سوود بەخشمان پێ دەکا لە ڕۆیێویێکی پان و بەرینی زمانەکەمان . لەرەتی پشکنین و تۆژینەوە لە زماندا بە گوتـانەوەی « بدیهیە »کانی نایەتە بەر چەژی پشکنەرو خوێنەر ، خەریك بتون بە وردەکاریی شی کردنەوە و هەڵوەشـاندنی رایـەڵ و تەقەڵەکانی ناوەرۆکی زمان و بەدوادا گەڕانی پەیوەندییەکانی ناوەکی « داخلی » مەیلەو نهێنی میانی وشە و رستەو داڕشتن و واتـای ئاخاوتن ، زاخاوی مێشك دەدەن و نیگا فراوان دەکەن . کە لەم گوتـارەدا ئەمەم بۆ نەکرێ هەلێـکی زلم دۆڕاندوە و خـۆشییێکی زیهنی شیرینکەلەم لەکیس چوە . تۆ بڵێی چەندمان زیاد دەکرد لە خەرمانـی زمانزانیمان ئـەگەر لە موناقەشەی وشەی « هیـچ » گەیشتباین بە دۆزینەوەی ئەو تایبەتییەی وای کردوە کە دەڵێی « فلانەشت هیچە ، فلانەشت هیچ نیە » هەمان واتا بەدەستەوەبدەی و « سـلب و ایجاب » وشەکە لەمطلقی « سلبیة » نەگۆڕێ ؟ وەك وشەی « هیچ » گەلێکی تریش لەوانەی بە راناو دانراون سەرگوزەشتی سەربەخۆیان هەیە و هەریەکەیان لەلای خۆیەوە تیشکێك داوێژێ بۆ یەکێك لە دەربڕینەکانی زمان . کە ئەم وردبۆنەوەیەم بۆ نەکرێ ناچـارم قسە لە تێکڕای ئەو « راناوانە » بکەم و رەخنەی گشتی لەو بنکە فکریە بگرم کە لە سەری هەڵچەقیون لەگەڵ دەربڕینی تـێبینی و سرنجی تایبەتـی خۆم ، کە هەبێ ، دەربارەی سەرجوملەی باسەکە .

وەك لێرە بەپێشەوە گوتم ئـەو کۆڵەکە ناوەندییەی باوەڕی

خاوەنانی فێرگەی « حەوت جۆر راناو »ی پێوە وەستاوە دەست دانی وشەکانە بۆ هاتنی « ناو » لەجێی ئەوان .

رەخنەیێکی بنجی سەرەتایی لەو تێفکرینە ئەوەیە کەوا گوێ ناداتە ئەو راستییە کە جۆر و چۆنەتی و سروشتی وشە لە پێشەوە و بەر لە هاتنی بۆناو رستە لەخودی وشەکەو واتای سەرهەڵدەدا و دەسەپێ ، هەر ئەوساش دەبێ ناوو عینوانی بۆ داندرێ ، لەوە بەولاوە کە بەپێی قابلیەتی واتاکەی دەستی دابچێتە قاڵبی جیاجیاوە ناشێ بگوترێ سروشتێکی نوێی لێ رسکا لە گوێرەی پێداویستی ئەو قاڵبە تازەیە ، بەنموونە دەڵێم کەوشەی «کەس» بەخۆی و واتایەوە بەر « تعریف » و سروشتی « ناو » کەوت ئیتر یەکجارەکێ دەبێ بە «ناو» لەقەڵەم بدرێ ، لەوە بەولاوە چوونی بۆ ناو قاڵبی جیا جیا حاڵەتی وشەکە دەگۆڕێ نەك واتا و جۆری . هەندێك ، یاخود بەشی زۆر ، لە زمانزانە تازەکانی کورد پەیڕەوی ئەوروپاییەکان دەکەن و دەسەلمێنن یەك وشە لە رستەیێکدا ئاوەڵناو «صفة» بێ و لەرستەیێکیتردا ئاوەڵکار « ظرف » بێ ، یاخود راناو ببێتە ئاوەڵناو .. هەرچەند من لێرەدا قسەم لەگەڵ «راناو»ە بەلام زیانێك نیە لەوەدا بڵێم زمانی کوردی ئاوەڵناو و ئاوەڵکار « صفة وظرف » ی لەیەکدی جودا کردۆتەوە بەر لەوە بچنە ناو رستە . ئاوەڵناو « صفە » زۆر بەرچاوە پێویست نیە من لیستەی بۆ بگرمەوە ، بەلام رەنگە لزوم هەبێ بڵێم بۆ ئاوەڵکار « ظرف » دوو صیغەی قەرارداده هەیە جگە لەوە کە وا دەبێ رستە و نیمچە رستەش دەوری « ظرف » ببینن : دەگوترێ « کورد مەردانە خەبات دەکا » وشەی

« مەردانە » ئاوەڵکارێکی بێ‌فێڵە و هەر لەگەڵ « کار ـ فعل » دا بەکار دێ و هەرگیز ناگوترێ دارا مەردانەیە یاخود زیرەکانەیە .
دەشگوترێ « حەز دەکەم لەگەڵت بە خۆشی رابوێرم » . ئەم وشەی « بەخۆشی » ئەویش ئاوەڵکارە و هەر وەسفی (کار ـ فعل) دەکا و نابێتە ئاوەڵناو ، تۆ ناتوانی بڵێی « دارا بەخوشییە ، من بەپیاوەتیم » .
ئێمە ئەگەر لاسایی زمانی بێگانە بۆ هەڵەمان نەبا دەزانین کورد وشەکانی وەك « چاك ، خۆش ، سارد ، گەرم ، جوان ، دزێو ، بەرز ، نزم ، تاڵ ، شیرن .... هتاد » ی لە بنەڕەتا بە « ئاوەڵناو ـ صفە » دروست کردوە و کە هیچ پێچەکە و خوارەکە و تەئویل لەئاخاوتندا نەبێ ئەمانە راستە و خۆ وەسفی ناو دەکەن ، واتە لە گوتنەوەی ئەو وشانە خەیاڵی کوردێك تەنها بۆ وەسف کراوێکی خاوەن گیان دەڕوا چ مادی بێ چ مەعنەوی و هەرگیز بەبیریدا نایێتەوە کەسێك بڵێ « ڕۆیشتم تاڵ ، دەڵێم شیرن ... » . ئەمە راستییێکە ، بەلای منەوە ، نەسەلماندن هەڵناگرێ : دەوجاکە بەپێی سەلیقەی کوردانەمان بڕیارمان دا « جوان . تێر ، خراپ » بە ئەسڵ « ئاوەڵناو ـ صفە » ن لەوە بەولاوە کە کەوتنە قاڵبی ئەوتۆ لە ڕواڵەتدا وەسفی غەیری ناویش بکەن نابێ زوَ تەسلیم بین و بڵێین ئەم وشانە سروشت و واتایان دۆڕاند و بوَن بە شتێکی جودا لە « صفە » .
بەلای منەوە کە گوترا « فلانەکەس زۆر دەخوا » لێرەدا هەرچەند لەبەر چاوان وشەی « زۆر » وەسفی ناویش ناکا لە راستیدا هەر « ئاوەڵناو » ە : دەتوانین بەوە دلنیا بین کە « موصوف » یێکی قرتاو هەبوە و تێچوە ، وەك ئەودي کەئەسڵی رستەکە « فـلانەکەس

خواردنێکی زۆر دەخوا » بتوبێ . تۆ سەیرکە وشەی « زۆر » لە رستەکەدا جێی « بەرکار - مفعول »ی حەزفکراوی گرتۆتەوە و لەپێش « کار - فعل » دوە هاتوە وەك « بەرکار، مفعول »ی صەریح، گریمان ئەو سازاندنە[5] ئیقناعیشمان نەکا و نەسەلمێنین بەرکاری[6] حەزفکراو هەبتوبێ، چ چار نامێنێ دەبێ بڵێین زمانی کوردی ئەوە هەڵدەگرێ ئاوەڵناوەکانی، کە لە بنەڕەتا بە ئاوەڵناوێ پەیدابتون، وەسفی کاریش بکەن و نەبنە ئاوەڵکار، واتە بکەونە حاڵەتێ وەها لە رستەدا کە رواڵەتی ئاوەڵکار بنوێنن، چونکە ئاوەڵناو بتونی ئەم وشانە دەمەتەقە هەڵناگرێ . سرنج بگریە ئەم میسالەی خواردوە نەختێکی تریش راستییەکەت بۆ ئاشکرا دەبێ، دەڵێی « دارا بە منداڵی ژیر بتو » . دەزانین وشەی « بە منداڵی » ئاوەڵکارە و داڕشتنەکەشی هەر هی ئاوەڵکارە . ئەدی وشەی « ژیر » چیە ؟ خۆ لە رستەکەدا نەکەوتۆتە جێگەی رێزمانی ئاوەڵناوەوە هەر چەند وشەی ژیر بۆ خۆی ئاوەڵناوە، چونکە دەزانین وشەی « صفە » لە کوردیدا دەکەوێتە دوای وشەی « موصوف »ەوە وەك بڵێی « منداڵی ژیر، مەلی جوان » ؟ کەواتە لێرەدا وشەی « ژیر » کە « ئاوەڵناو »ێکی راستەقینەیە بە پێی

---

(٥) سازاندن : تعليل .

(٦) ایزنەی رێزمانی سەر بە کۆڕی زانیاری کوردەوە، دوای لێکدانەوەیێکی دوور و درێژ « کار ، کارا ، بەرکار »ی پەسند کرد بە واتای « فعل ، فاعل ، مفعول » لێرەدا ماوەی شەرحدان نیە ، کە پێویست بۆ خۆم ئامادەم گۆشەی نیگای ایزنە روون کەمەوە .

پێویستی دەربڕینی مەبەس کەوتۆتە قاڵب ، یاخود حاڵەتێك مـەودای نادا خۆ لەناوێك بذاڵێنێ و وەسفی بکا هـەرچەنـد زمانی کوردیی ئەو و ئاوەڵەکانی بو وەسفی « ناو » خەلق کردوە .

بەلای منەوە هەروەك ناشێ وشەی « هات » جارێکیان فیعل بێ و جارێکیان « حرف جر یاخود ناو یاخود ئاوەڵناو » بـێ هەروەهاش کە وشەی « چەند »مان بە « ناوی پرسیار» دانا ناکرێ لە دێڕێکدا ناوی پرسیار بێ و لەدێڕێکی تردا ئاوەڵناو یاخود راناو بێ . نوسـەری کورد هەیە لەو باوەڕەدایە کە گوتت « چەنـدت ژمارد ؟ » لێرەدا وشەی « چەند » دەبێتە « راناو ، ضمیر » چونکە ئیمکان هەیە جێی ژمارەیێـکی گرتبێتەوە وەك لە وەرامدا بڵێی « بیستم ژمارد » . بەڵام کە گوتت « چەند کەست ژمارد ؟ » وشـەی « چەنـد » دەبێتە « صفە ، ئاوەڵناو » چونکە وەصفێکی وشـەی « کەس » دەکا .

سەلماندنی ئەم باوەڕە ، کوردی گوتەنی ، دەرگەی خێران لە راناو دەکاتەوە و دەیخاتە سەرپشت و بەشێـکی زۆری وشـەی فەرهەنگی کوردی دەکا بە راناو . کە گوتت « باوکم هـات » دەبێ لێرەدا وشەی باوکیش راناوبێ چونکە دەتوانی بی‌گۆڕی بـە نـاوی باوکت و بڵێی « برایم بەگ هات » کە ناوی باوکت برایم بەگ بێ . هەروەها هەمو وشە ناوەکانی کەس و خزم و برادەر و جـیران و دۆست و دوشمنت دەبنە راناو چونکە « ئامۆزا دایك ، خوشـك ، بـرا ... تا دەگاتە خـزمی خەزوری سەپانی شێخی » هەمویان

ئەحمەدێك ، حەسەنێك ، فـــاتیلەیێك هـەر هـەن بچنـە جێی ئەو وشانەوە . ئەوەی راستی بێ کە ئێمە بسەلمێنین بە پێی گۆڕانی جێگەی وشە لە رستەدا عینوان و دەوریشی دەگۆڕێ دەبـێ بڵێین « برایم بەگ »یش راناوە چونکە « برایم بەگ هات » دەشێ بکرێتە « باوکم هات » . وشەکانی وەك ترێ ، سێو ، هەنار ، هەرمێ ، تەماتە ، نارنج .. هتاد ئەوانیش دەبنە راناو چونکە ئیمکان هەیە کە گوتت « هـــەنارم کڕی » وشەی هـــەنارەکە بگۆڕی و بڵێی « میوەم کـڕی » ، مـــیوەش وەك هەنـار دەبێتەوە رانـاو بـــە هەڵـگێڕانەوەی میسالەکە . هەرچی پۆشاك و ئاژەڵ و سوتەمەنی و تەقەمەنی و پێڵاو و گوڵ و درەخت و چەك و پارە ... خولاسـە هەمتو ئەوانەی پێیان دەڵێن « اسم الجنس » دەســـت دەدەن بـــە خۆیان و موفرەداتیانەوە ببنە راناو . ئەمە لیستەیێك لە نمونەی رستە بۆ رونکردنەوەی مەبەس :

١— خەنجـەرم کـڕی ، چەکم کڕی .

٢— چۆخەڵم لەبـەرکرد ، جلکم لەبەرکرد .

٣— وەنـەوشـەم دیـت ، گوڵم دیت .

٤— سوتەمەنی دەکـڕم ، نەوت و دار و چیلـکە دەکڕم .

٥— فـــلانەکەس هـات ، ئەحمەد هات .

٦— مامـــم هـــات ، ئەحمەد هات .

جەز دەکەی نیوەی وشەی فەرهەنگی کوردی بێنە و بیکە بە

راناو ، یەکی تەعبیرت ناکەوێ و دەتوانی رستەیێك بێنیەوە بۆ ئەو ناوەی مەبەستە خۆی تێدا نەناسێتەوە یاخود سـواری چـەرخ و فەلەکی رستە گۆڕێ بکەی و هەر ساتە خۆی لە بارێك ببینێ .

بە ئانقەسـت نمونەی پێنجەم و شەشەمم هێناوە لە لیستەی سەرەوە تا ئەوانەی « فلانەکەس » بە راناو دادەنێن چاریان نەمێنێ و لێیان بسەلمێنن ، لەبەرخاتری باوەڕەکەی خۆیان ، مام و ئەحمەدیش بـە راناو قبول بکەن چونکە فلانەکەسەکە هەر خۆی مامم بێ هەر خۆی ئەحمەدیش بێ .

بە راستی ، دەردەکەوێ ، ئەم راناوە باری زمانزان سوك دەکا چونکە چ نامێنێتەوە نەبێتە راناو و لەکۆڵ دەردی سەری دابەش کردنی ئاخاوتن دەبینەوە . سەیری ، هـەولێر و کەرکوك و ئەدیس ئەبابا ئاگایان لە خۆیان نیـە ئەوانیش راناون ، چونـکە وەك دەتوانی بڵێی « هەولێرم دیت » دەتوانی هەولێرەکە بکەی بە شتێـکی تر و بڵێی « ئاوایم دیت ، شـارم دیت ، کۆمەڵە خانو و قەڵەباڵغیم دیت ، کەونە شاری ئاشورم دیت ... » .

وا دەزانم دیارخستنی چەند و چۆنی بەشەکانی ئاخاوتن بە گوێرەی حەقیقەتی واتای وشە ، تا کە رێگەیێکە لە پێش زمانزان ، چونـکە تێکەڵ کردنی ( حاڵەتی وشـە و واتای وشـە ) هەمو حیساباتی سەرەوبن دەکا . بۆ خۆت جارێـکی تر سـەیری سەرجوملەی ئەو وشانە بکە کە دەکەونە ناو جەزی ئەو حەفت جۆرە راناوەی لێرە

بەپێشەوە نوسیمن[٧] ، دەبینی وشـــەکان هێندە لە یەکدی دوَرن و بابەتی وەهـا جیاجیایان تێـــدایە لزوم نامێنێ وشەی تازە بەێتونە بێنینەوە بۆ دەرخستنی نادروستی ئەو تەقسیماتە . باوەڕ دەکەم تۆش لەگەڵ مندا سرنج بگری دەگەی بەو قەناعەتەکە وا هەرچەند بمانەوێ دوَ بەشی لە یەکـــدی جودا لە ئاخاوتندا پەیدا کەین ، وەك ئەو جوداییەمان بۆ نادۆزرێتەوە کە لە میانی وشەی « ئایا » و وشەی « فلاَن و فیـسار » دا هەیە . بە راستی هەرگیز کار و چاوگ « فعل و مصدر » هێندی ئەم وشـانە لە یەکدی دوَر نین : لەگەڵ خۆتدا بڵێ « فلاَنە کەس .. ئایا » و بەیەکدییان بگرە ، ئینجا بڵێ« کردن ، کردی — نوستن ، نوست » و ئەمانیش بە یەکدی بگرە . ئینساف لێمان داوا دەکا چ دوَ دڵی نەکەین لەوەدا کـــە بڵێین « کردن و کردی » یەك شتن ئەگەر لە پێشەوە سەلماندبێتمان ئایا و فلاَنەکەس هەردوَیان راناو بن .

لە هەموَ کارێـکی زیهنیـــدا ، کە زمان یەکێکە لە هەرە پێشەوەی ئەو کارانە ، ورد بوَنەوە و قوَڵ داگرتن و زەڕژەبینی — مەرجی پسپۆڕێی و وەستایی و شارەزایی‌یە نەك پان بوَنەوە بەسەر

---

(٧) ساغ کردنەوەی پێش‌خستن و پاش‌خستنی راناوە لکاوەکان لێرەدا جێی نابێتەوە پێویستە بە وردی باس لەوە بکرێ ئایا « کتبتهم » بنوسرێ « نوسیمن ، نوسینم ، نوســیانم ، نوســیمیان » . کە دەرفەتم بیێ لە شوێنی خۆی لەم گوتارەدا هەندێـکی لەسەر دەنوَسم ، ناشتوانم لە ئیستاوە بەڵێن بدەم چونـکە بۆ خۆم نازانم سنوَری نوَسینەکەم تا کوێ دەڕوا و چ روَپێوێك « مساحة » دەگرێتەوە ، لەبەر زێدە بەر فرەوانی مەوزوَع .

بابەتدا . مرۆڤ دەبێ ئاگای لە خــۆی بێ بەر تەڵە و فاقەی ڕواڵەتی درۆزن نەکەوێ ؛ تۆ ئەگەر ورد نەبیـەوە ، نەخێر ئەگەر تەلەسکۆپ بەکار نەهێنی ، وا دەزانی ڕوی مانـگ وەك ئاوێنەیێکی لەکـکەدارە ، ئەوەندەش لەو ڕواڵەتە دڵنیا دەبی پاکانەی بۆ دەکەی و زۆر بەلـگەی عەقلی و مەنتیقیشی بۆ دەهێنیەوە : کە یەکێك لە ڕێی تەلەسکۆپەوە کەژ و دۆڵ و لوتـکە و گردۆلـکەی تێدا دیتەوە و وێرای دۆزینەوەکەی ئاشکرا بکا ، ڕەنگە هەر بە شێتی دانێی . بۆ میـــال و بە نیازی ڕوَن کردنەوەی بیر و باوەڕی خــۆم ، بەشی « راناوی کەسی Personal Pronoun » کە بەلای هەمتو زمانزانانەوە راناوە و بە جێگری ناو دانراوە ، دێنمە بەر سرنج و هەندێـکی لێ ورد دەبمەوە لە گۆشەی نیگای خۆمەوە تا بزانین ئاخۆ ئەم چەند وشــە بێگومان و بێفێڵە « من ، ئێمە — تۆ ، ئێوە — ئەو ، ئەوان » کە راناوی میراتین لە مێژوَی کۆنەوە ، هــەمتویان وەك یەکن و یەك قابلیەتیان هەیە لە جێگرتنی ناو و بـەکار هێنانیان لە رستەدا ؟

دەزانین ئەم کۆمەڵە وشەیە بە سێ بەش دابەش دەکرێن :

١— کەسی یەکەم « قسەکەر » ، من و ئێمە ؛

٢— کەسی دوەم « قسە بۆ کراو » ، تۆ و ئێوە ؛

٣— کەسی سێیەم « قسە لێ کراو » ، ئەو و ئەوان .

تا ئێرە گرفت نیــە و بەدیهیەمان کوتاوەتەوە ، جارێ باس

لەوەش ناکەین وێنەیێکی تری ئــەم وشانە هەیە کە پێی دەڵێن « راناوی لـکاو ، ضمیر متصل » چونکە ئێشمان بەو باسە نیە لێرەدا ، هەرچەند ئەویش بەر « بدیهیە » دەکەوێ و زانیاری بازاڕییە .

بەڵام دوای ئەم مەعلوماتە سادەیە ، ورد بوونەوە و پێوانە و کێشانەی لەسەرەخۆ راستیێك دەردەخا کە ئـەم کۆمەڵە وشــەیە ، گردەبڕ ، دەکا بە دوو کەرتی لەیەکدی جــودا ، جوداییەکەش وەك ئەوە نیە کە گۆڕانی حاڵەتی وشە لە رستەدا پەیدای دەکا ، نەخـێر جوداییەکە لە دەروون و قابلیەتی وشەکاندایە :

سرنج بگرە لەم رستانە :

من مرۆڤــم — ئێمە مرۆڤین .

تـۆ مرۆڤی — ئێوە مروفن .

ئەم راناوانەی کەسی یەکەم و دوەم قبوڵ ناکەن هیچ ناوێك وە یا وشەیێك جێگەیان بگرێتەوە . راناوی « من » بــۆ رســتە پێکهێنان تەنها لەگەڵ جۆرە لـکاوەکەی خــۆی کە پیتی « م » ە دەبێتە « فاعل » یاخود « مبتدأ » یاخود « Subject » یاخود هەر شتێکی تر بێ ، بەتەواوی خۆی لە قەبەڵ جۆری لـکاوی کردوە هــەر دەڵێی خۆی لە قەبەڵ خۆی کردوە . کە دەڵێم « من کوردم » ناتوانــم هیچ وشەیێکی فەرهەنگی کوردی و غــەیری کوردی لە جێگەی ئەم « من »ە دانێم تەنانەت کە ناوم « دارا » بـێ و بشمناســیت ناتوانم بڵێم « دارا کوردم » هەروەها کە گوتم « تۆ ئازایت » رێم نیە بڵێم « قوتـابی ئازایت » کە خــۆت قوتابـی بیت . هەڵبەت

« ئێمه و ئێوه »ش وەك « من و تۆ » وان له نەبۆنی ئیمکانی هاتنی وشەی غەیری خۆیان بۆ جێگەیان له رستەدا . راناوی لکاوی کەسی یەکەم و دوەم دەست نادەن ، هەرگیزا و هەرگیز ، ببن به تەواوکەری رسته لەگەڵ غەیری راناوه نەلکاوەکانیان . نەکا بـه سەهۆم بردبیت ، یاخود تایبەتییێکی ئەم راناوانەم لێ شاردبیەوه ، دەبێ ئەوه بڵێم له یەك حاڵدا رێ هەیه راناوی لکاوی « ئێمه و ئێوه » ببێته تەواوکەری رسته لەگەڵ غەیری دوَ وشەی « ئێمه و ئێوه »دا ، حاڵەکەش ئەمەیه که لەم نمۆنانەدا دەردەکەوێ . دەگوترێ :

من و دارا و برزوَ شاگردین .
دارا و برزوَ و تۆ شاگردن .

ئەم رێ دانه زیرەکیەکی گەورەی تێدایه چونکه هاتنی وشەی دارا و برزوَ لەگەڵ راناوی « من »دا ، فاعیلەکه یاخود « متبدأ »ەکەی کرد به « جمع » ناکرێ راناوی لکاوی تاکی بەدوادا بێ ، خـۆ دیاره ناشکرێ « جمع »یك بێ به دوا ئەو فاعیله وەیا « متبدأ »ەدا که کەسی یەکەمی تێدایه مەگەر ئەو جەمعه بۆکەسی یەکەم بێ . نزیکی کەسی یەکەمی تاك له کەسی یەکەمی جەمع دەیانکا به هاودەنگی یەکتر . کەسی یەکەمی تاك که لەگەڵ کەسی یەکەمی جەمع تەنها له روَی ژمارەوه جودایه ، لەگەڵ کەسی دوەم و سێیەمی جەمع له هەمۆ روَێکەوه جودایه ، حاڵی کەسی دوەمی تاکیش وەك کەسی یەکەم وایه ئەویش خزمـه لەگەڵ جەمعی کەسی دوەم ، هێنده هەیه که دەڵێی « تۆ و برزوَ مرۆڤن » راناوه لکاوەکەی « ن » به رێکەوت بۆ جەمعی دوەم و

جەمعی سێیەم هەر یەکێکە ، هەڵبەت تۆ لە رستەدا مەبەستت جەمعی کەسی سێیەم نیە . سەیری ، کە دەڵێی « تۆ و برزو توسیتان » راناوەکە هی کەسی دوەمی جەمعە نەك هی کەسی سێیەم ، چونکە لە کاری تێپەڕدا راناوی لکاوی جودا هەیە بۆ هەرکەسە .

ئینجا با بێینە سەروکاری کەسی سێیەم :

دەگوترێ :

ئەو مرۆڤە          دارا مرۆڤە          کێ مرۆڤە ؟ .

ئەوان مرۆڤن          کورد مرۆڤن          هەمویان مرۆڤن .

راناوی کەسی سێیەم دەست دەدا وشەیتر بێتە جێگاکەی ، هەر بەو پێیەش راناوە لکاوەکەی ببێتە تەواوکەری رستە . کەسی سێیەم ، بەهۆی ئەوەوە کە خۆی غائبە ، دەبێتە خزم لەگەڵ هەمو غائبێك و دەشێ غائب جێی بگرێتەوە . لەوەش زیاتر ، هەر لەبەر خاتری ئەو غائبانەیە راناوی کەسی سێیەم دروست بوە . بەڵێ راستە لە بنەڕەتا راناوی « ئەو ، ئەوان » بۆ مرۆڤ داهاتوە ، ئێستاش کە دەڵێی « ئەو » بەر لە هەمو شتێك مرۆڤت بە بیردا دێ و حەز ناکەی لە رستەدا « ئەو » بە سەراحەت بۆ غەیری مرۆڤ بەکار بێ ، بەڵام دوای داهاتنی ناچارە مل کەچ بێ بۆ هەمو ئەنجامێك کە « غیاب » لێی دەوەشێتەوە . با لە موناقەشەی ئەوە گەڕێین ئاخۆ چۆن دەتوانین ، یا ناتوانین ، راناوی « ئەو و ئەوان » بۆ غەیری مرۆڤ بەکار بێنین ، خۆ لە فەرهەنگدا چەندین وشە بۆ مرۆڤ بەکار دێن وەك تێکڕای

« اسم علم » و ناوی گەل و کۆمەڵ و خزم و کەس و ئیشارە و پرسـیار و « مبهم » و ئایین و حیزب و مەزهەب و نازام چی ، هەمووشیان غائبن وەك کەسی سێیەم [ راستییەکەی ، ئەم وشانە کەسی سێیەمن ، دوو وشەی « ئەو و ئەوان » راناوی کەسی سێیەمن ] . دەوجا کە راناوێك دەلالەتی ئەو غائبانە بدا و لەبەر ئەوان پەیدا بووبێ دیارە جۆری لکاویشی دەبێتە تەواوکەری رستەکانیان .

ئەم تایبەتیەی « غیاب » کە لەراناوی کەسی سێیەمدا هەیە و کۆی دەکاتەوە لەگەڵ هەموو « غائب »ێك لەو رووەوە کە هەرچی « غائب » هـــەیە ئەویش کەسی سێیەمە ، رێی خۆش کردوە لەبەر خامەی زمانزانان بۆ لێك کێشانەوەی پەراوێزی « راناو » تا ئەو هەموو وشەی لەیەك دووره بگرێتە ناو باوەشی خۆیەوە . بۆ خۆت دەبینی وشەکانی شەش بەشی « راناو » لەو حەفت بەشەی ژماردمان کە حیساب کراون بە راناو هەموو دەبنە راناوی کەسی سێیەم . ناتوانین یەکێك لەو وشانە بکەین بە راناوی کەسی یەکەم یا دووەم[8] . باوەڕ دەکەم ئەم « غیاب » ە خلیسکە لەبەر پێی زمانزان ، دەبێ لێی بەپارێز بێ .

لەوکورتە سرنجەی لە راناوی « کەسی ، شخصی Personal » مان گــرت بۆمان دەرکەوت ئەو زمانزانەی لە رێی قابلیەتی هاتنی ناو بۆ شوێنی وشـــەیێك ، وشەکە بکا بە راناو ، پەکی ئەوەی دەکەوێ « من ، ئێمە — تۆ ، ئێوە » بە راناو دانێ چونــکە مەعلوممان کرد هیچ ناوێك ، وە یا غەیری ناویش ، ناشێ جێگەیان بگرێتەوە

---

(٨) حیکایەتی « خۆم ، خۆت » دواتر دێ .

له رسته‌دا . پێی ناوێ بڵێم ، له خۆته‌وه ده‌زانی ، له‌لای رێزمانه‌وه واتای وشه‌کانی « من ، تۆ .... » که ده‌لاله‌تی شه‌خسیان هه‌یه هیچ ئه‌وه ئیسپات ناکا که راناون چونکه ده‌ستوری رێزمان له چۆنه‌تی ره‌فتاری وشه‌وه وه‌رده‌گیرێ نه‌ك واتای وشه : هه‌ر وشه‌ی « راناو » بۆ خۆی راناوی رێزمانی نیه ، وشه‌ی « فعل ، کار » ئه‌ویش فیعل نیه ، ئاوه‌ڵناویش ئاوه‌ڵناو نیه . که ده‌ڵێی « ناوی من نوسرا » هه‌رچه‌ند له روی واتاوه وشه‌ی « ناو » له رسته‌دا مه‌فعولێکه ئاو لێڵ ناکا ، به‌پێی ده‌ستوری رێزمان پێچه‌وانه‌ی مه‌فعوله . که رسته‌کت گۆڕی و کردته « ناوی منی نوسی » ئه‌وسا وشه‌ی « ناو » ده‌بێته مه‌فعول .

کاکڵی گوته ، لێره‌دا ، ئه‌وه‌یه ئه‌گه‌ر میقیاسه‌کانی کلاسیکی بکه‌ین به دیارده‌ری راناو ، دوبه‌ش له سێ به‌شی ئه‌و وشانه‌ی تا ئێستا لای هه‌مو دونیا راناو بوه له « راناوی » ده‌که‌ون ، واته وشه‌کانی « من ، ئێمه ـ تۆ ، ئێوه » به‌ر ئه‌و مه‌فهومه ناکه‌ون که « ئه‌و ، ئه‌وان » ده‌کا به راناو .

جگه له‌م تایبه‌تیه ، تایبه‌تیێکی تری واتاییش سه‌رله‌نوێ که‌سی یه‌که‌م و دوه‌م جیا ده‌کاته‌وه له که‌سی سێیه‌م : په‌یوه‌ندی که‌سی یه‌که‌م و دوه‌م به مرۆڤه‌وه گه‌لێك به‌تینتره له هی که‌سی سێیه‌م ، چونکه وه‌ك به‌دیهیه ئاشکرایه له مرۆڤ به‌ولاوه مه‌خلوقێك نیه قسه بکا و بڵێ « من وام کرد ، ئێمه رۆیشتین » ، به‌نیسبه‌ت که‌سی دوه‌میشه‌وه دیاره له بنه‌ڕه‌تا مرۆڤ وتووێژی هه‌ر له‌گه‌ڵ مرۆڤ بوه ، دوایی به پێی په‌ره‌سه‌ندنی مامڵه‌تی مرۆڤ له‌گه‌ڵ جیهان و فره‌وان

بۆنی جعزی ئاخاوتنی ، غەیری مرۆڤیش بوە بەکەسی دوەم . سەرنج بدە تا ئێستاش بە دەگمەن و لە حاڵی تایبەتیدا نەبێ راناوی « تـۆ ، ئێوە » بۆ دار و بەرد و ئاژەڵ و چشتی ئەوتۆیی بەکار نایێ . ئەم لەقەبەڵ بۆنەی راناوی کەسی یەکەم ، تا رادەیێکیش کەسی دوەم ، بۆ مرۆڤ سروشتی وشە داخوازتی دەکا نەك دەستوری زمان . واقیع وایە مرۆڤ نەبێ ئاخافتن ناکا ، بەڵام رێـزمان چ مانیعێکی نیە لەوە کە هەرچی هەیە لە جیهاندا بە دەنگ بێ و بێئاخێوێ ، ئەوساش قسەکەر مرۆڤ بێ یا گۆچان ، فیعلی رابردوَ یەك داڕشتنی دەبێ بۆ هەردوَیان و دەگوترێ « من بێژام ، من چەمام » . خـۆت دەزانی وشـەی پرسیار لە بارەی ئادەمزادەوە « کێ » یـە و لە بارەی غەیری ئادەمزادیشەوە « چی » یە ، بەڵام لە رستەدا چ فەرقێك نیە لە میانی بەکارهێنانی « کێ ، چی » و دەڵێی « کێ هات ، چ قـەوما » . زمانزان دەبێ خۆ بپارێزێ لە تێکەڵ کردنی فەلسەفە و زمان و ئاگای لە خۆی بێ دەستوری فەلسەفە و مەنتیق نەکا بە دەستوری زمان : بۆ دانانی رێزمان ، زانست و فەلسەفە و مەنتیق و لێکدانەوە هەمـو دەبنە ئەمرازی دۆزینەوەی یاساکانی زمان نەك یاساکە خۆی . دەبینی هەندێ زمان سورن لەسەر جیاکردنەوەی نێر و مێ ، زیاتـر لە جیاکردنەوەی تاك و کەل لە ئاخافتندا کەچی زمانێکی‌تر ئەمـەی نەکردوە ، خۆ مەعلومیشە مەنتیق و زانست و فەلسەفە یەك نرخاندنی هەیە بۆ ئەم شتانە و چ گوێ ناداتە دەستوری زمانەکان ، سەلیقەی هەر میللەتە بە پێی ئەو زەرفە مێژوَییە کە تێیـدا ژیاوە رێگایـەکی گرتۆتە بەر بۆ دەربڕینی واتا و داڕشتنی گوتە ، لەوکارەشدا دەستوری

وەهای داناوە کە لەگەڵ سروشت و تایبەتیەکانی خۆی ڕێك کەوێ ؛ با بڵێم مەنتیقێکی زادەی سەلیقە و زەوقی ئاخاوتنی پەیدا کردوە کە زۆر جاران لەگەڵ مەنتیقی فەلسەفە و زانستی ڕوَت ناگونجێ . بەلای منەوە ڕواڵەتێکی بێ هێز و پێزی وەك ئەوەی وشەی « فلان » دەتوانێ جێی خۆی چۆل کا بۆ « دارا » هەرگیز بە مەنتیقی زمان غەلەبە ناکا لەسەر ڕاستیێکی زۆر بەهێز و پێز کە سروشت و واتای وشەکە خۆیەتی . ئەم ڕواڵەتە لە مەنتیقێکی دەرەوەی زمانەوە ، کە مەنتیقی لێکدانەوەی زمانزانانە و بەسەر زمانیاندا سەپاندوە ، بایەخی زیاد لە مافی خۆی وەرگرتوە و هەندێ ڕێچکۆلەی زمانی تەماوی کردوە .

یەکێك لەو بڕیارە غەلەتانەی کە لە مەنتیقی دەرەوەی زمانەوە بەسەر ڕێزمانی کوردیدا بڕاوە ، ئەوەیە کە دەگوترێ چونکی کوردی لە زمانەکانی هیندی ـ ئەوروپایی یە نابێ ڕستەی بێ فعلی تێدا بێ ، هەر لەو بڕیارە غەلەتەوە گەلێك ڕاست بە هەلە دانراوە و گەلێك هەلەش کراوە بە دەستور . ئەو زمانزانانەی بڕیاری وایان داوە گوێیان نەداوەتە واقیعی سەربەخۆی هەر زمانێك لە خێزانی هیندی ـ ئەوروپایی ، بەلکو مەیلەو بە پەلە ڕواڵەتێکی بەرچاوی هەندێك لە زمانانی ئەو خێزانەیان پان کردۆتەوە بەسەر هەمو زمانەکانی و بێ دوَ دلی کردوَیانەتە دەستورێکی گشتی . گومانم نیە لەوەدا بڕیاری باس لێکراو ئەو غەلەتە گەورە بەناوبانگەی تێدایە کە لە « اصول الفقه » پێی دەڵێن « مصادرة[9] علی المطلوب » چونکە بڕیارەکە

(٩) شەرحی ئەم زاراوە گەلێك پتری پێدەوێ ، بە داخەوە لێرەدا دەرفەتنیە .

هەڵوەستێکی نارەوا و نارَاست دادەهێنێ بۆ دزینەوە و دەست بەسەر داگرتنی ئەو مەوزوَعە کە جێی موناقەشە و دەمەتەقەیە : خۆ ئێمە جارێ نەمانسەلماندوە هەمو زمانێکی هیندی ـ ئەوروپایی لەو بابەتەن تا بسەلمێنین کوردیش لەو بابەتەیە ، موناقەشەی ئێمە لەسەر ئەوەیە ئایا لە کوردیدا رستەی بێ فعل هەیە یا نیە کەچی بڕیارەکە هەر لەپێشەوە دەستی بەسەر مەوزوَعدا گرت و بێ ئەوە لە کوردی بکۆڵێتەوە رستەی بێ فیعلی لێ یاساغ کرد . چ فەرقێك نیە لەوەدا یەکێکی تر بێ و بڵێ (چونکە لە کوردیدا رستەی بێ فیعل هەیە دەبێ لە هەمو زمانەکانی هیندی ـ ئەوروپاییش رستەی بێ فیعل هەر هەبێ ) هەڵبەت ئەمەش هەر « مصادره »یە چونکە جارێ نە ئەوە سەلمێنراوە کە لە کوردیدا رستەی بێفعل هەیە و نە ساغیش بۆتەوە هەمو زمانەکانیتریش تیێاندا هەیە .

بەلای باوەڕی منەوە وەك بەدیهیە وایە کە کوردی رستەی بە فیعل و بێ فیعلی تێدایە و هەر لەو حاڵەتەدا رستە بێفیعلەکانی نابینین کە بە چاویلکەی خوازرایەوەی زمانزانەکانی بێگانە سەیری زمانی کوردی بکەین : ئینکار کردنی هەبونی رستەی بێفیعل لە کوردیدا ئەو خلیسکەمان پێ دەبا کە ، کوردی گوتەنی ، تەوقیسەری رێزمانەکەمان بە ئەرز دەکەوێ ، چونکە بەشێکی گرینگ لە بنج و بناخەی زمانەکە هەڵدەتەکێنێ : فەرمو سەیری ئەم میسالانە بکە و بەدوا ئەودا سەرنج بگرە لە ئەنجامی نەسەلماندنی هەبونی رستەی بێ فیعل لە میسالەکاندا ، دەگوترێ :

من پاك بـوم .

من پـاك دەبم .

رستەی یەکەم صیغەی رابردوَ و رستەی دوەم داهاتـوَی کاری « بوَن »ە و دەتوانی وشەی پاك هەڵـگری و بڵێـی « بوم ، دەبم » هەروەك دەڵێی « نوستم ، دەنـوم ـ خواردم ، دەخـۆم » . لەم رستانەدا فیعل هەن و جێی دەمەتەقە نین .

ئینجا سەیری ئەم رستەیە بکە :

من پاکم .

لێرەدا کام بەشی رستە فیعلە ؟ هەڵبەت دوَ وشەی « من ، پاك » نەکەس دەڵێ فیعلن و بە زورەملێش نابنە فیعل . ئەوەی دەمێنێتەوە لە رستەکەدا و دەکەوێتە بەر هەست تەنها پیتی « م »ە ، ئاخۆ ئیمکان هەیە پێی بگوترێ فیعل ؟

تاقمێك لە زمانزانەکان خۆ لەوە لا دەدەن بـەو تـەرزە بەشـەی ئاخاوتن بڵێن فیعل چونکە لە حیسـابی وانیشـدا بە راناو دانراوە ، بەلام کۆڵیش نادەن لە دەعوای هەبوَنی فیعل لە رستەی کوردیدا ئیتر دەڵێن لە میانی کۆتایی وشەی پاك و پیتی « م »دا دەنـگێکی بێهێز هەیە ئەو دەنـگە فیعلە . ئەم دەعوایە نەك جارێك ، چەندین جار رەش دەبێتەوە و لەبەر یەك هەڵدەوەشێ و بەسەرخۆێدا دەتەپێ بێ ئەوە ئەرکێـکی چەندان بە خەرج بدەین :

ئەگەر ئەم دەنـگە بێهێزە فیعل بێ کەواتە دەبێ لە « مضاف و

مضاف إليه » شدا فیعل هەبێ چــونکە ئــەو دەنگە بێهێزەی تێدایە ، وەك کە دەڵێی « کورِم ، کچم ، خێزانم » .

با لە ئێزافە گەرِێین و بلکێین بە هەمان میسال کە هێنامانەوە ، بەڵام ئەمجارەیان کەسی یەکەمی جەمعی بۆ بەکار بێنین ئەوسا دەڵێین : « ئێمە پاکین » . دەبینی لێرەدا پیتی « ك » چ بزوێن و دەنگی بێهێزی بەدوادا نایێ و راستەوخۆ راناوی « ین » دەکەوێتە شوێنی ، کەواتە ئەو خــۆ هەڵەرِیواندنەش جێگەی نەما کە لە میسالەکەی پێشوودا جنجرۆکی مرۆڤی نەسەلمێنی لێ گیر دەبوو .

دیسانەوە با واز لە جەمع بێنین و بادەینەوە ســەر میسال بۆ کەسی یەکەمی تاك وەك میسالەکەی « من پاکم » :

دەڵێی « من ئازام ـ من خەلقی لادێم ـ من ئامادەم ـ مـن کاکە برزوم ... » لەمانەدا چ دەنگێکی بێهێز نیە لە میانی کۆتایی وشەکان و راناوەکە تا وەهمی جنۆکاویش گومانی راناوی لێ بکا .

راستی ، ئەم دەنگە بێهێزە کە دێتــە ناو رستەی وەك « پاکم » لە ناچارییەوە دێ ، چونکە تۆ ناتوانی « تلفظ » بکەی بە پیتی « کاف » ی وەستاو و بەدوا ئەودا « میم » یێکی وەستاو بێنی ، چ عەلاجت نیە دەبێ « کاف »ەکە قــورسکەی بۆ درکاندنی « میم » ەکە . لێرەدا تۆ پیتی « میم » لە دەرەوەی وشەوە دێنی و دەیلکێنی بە وشەکەوە کە ئەمە سەرلەنوێ ناچارت دەکا « کاف »ەکە قورسکەی تاکو مەعلوم بکرێ لەوێدا وشە کۆتایی دێ : وا هەیە

ئەناو خودی وشەکەدا ئەم قورس کردنەی پیتی پێش کۆتایی وشـــە دەبێتـــە کاری ناچاریی چونـکە هەندێك پیت کە کەوتنـــە پێش هەندێـکی ترەوە ئیمکان نیە بە وەستاوی «سکون» تەواوەوە « تلفظ » بکرێن . کە گوتت « کرم » بـۆت ناکرێ « رێ و میم »ەکە هەردوان بەجارێ بوەستێنی ، هەڵبەت دەبێ یەکێکیان قورس‌کەی ، کە مەعلـومە پیتی « رێ »یـەو « میم » نیە چونـکە « میم »ەکە کەوتۆتە کۆتایی وشەوە و جێگەی خۆی هی وەستانی تەواوە . هەروەها کە دەڵێی « شەکر » دەبێ « کاف »ەکە قورس‌کەی . هەندێ دەنگ هەیە هەردوو حاڵەتان هەڵدەگرن ، واتە وەســـتانی تەواو و قورس کردن ، وەك کە دەڵێی « دەنك » دەتوانی « نون »ەکە بوەسـتێنی و دەشتوانی قورسی کەی . واش دەبێ پیتی پێش کۆتایی وشە قورس کردن هەڵناگرێ وەك « دەنگ ، رەنگ ، ماست ، بیست ، مەرد ، بەرد ، کەرت ، شـــەرت . . » . کورتەی قسە ئەوەیە ئەم دەنـــگە زۆر بێهێزە کە وا دەبێ پێی دەڵێن « کسرة مختلسە ، Stress ، قورس کردن — من پێی‌دەڵێم بزوێنی بێ‌تەردف » چ پەیوەندێیـکی نیە ، کەم و زۆر ، بە رێزمانەوە و کارێـکی ســـەر بە زانســـتی « فۆنێتیك » ە . تاکو ئێستاکەش کەس دەرسی دەنـگەکانی زمانی کوردیی نەکردوە لە رووی قابلیەتی هەر دەنگێك بۆ وەستاندنی لەپێش دەنگێـکی وەستاوی‌تردوە . من بە شێوەیێکی سەرەتایی نەختێك لە مەوزوعەکە ئێفکریتوم ، رەنـــگە تا رادەیێك گەلاڵەی نیمچە دیراســـەیێکیشم کردبێ ، بەڵام هێشتا لێکدانەوەکانم نەخستۆتە سەر یەك و رێـکم نەخستون ، سەرەڕای ئەوە کە وا جارێ زۆریشی

بە بەرەوە ماوە .

کەواتە دڵ خۆش کردن بەو ڕواڵەتە بێ بایەخە لە کارێکی وا گرنگدا ، کە بڕیار دانی بوون و نەبوونی فیعلە لە ڕستەی کوردیدا ، جگە لەوە کە هەرچی زانستی زمانە و هەرچی هۆش و هەست و مەنتیقە گاڵتەی پێ دەکا ، هەر خۆی ، واتە ئەو دڵ خۆش کردنە ، نیشانەی بێ بایەخ کردنی ڕێزمان و دەستوورەکانیەتی چونکە قبول کردنی ڕواڵەتی بێ هێز و بێ دەلالەت و بێ نرخ بە بەلگەی زمانەوانی بۆ ئیسپات کردنی مەسەلەیێکی زلی ڕێزمان هەرچی متمانییە نایهێڵێ و دەمانباتە سەر ئەو قەناعەتە کە وا ڕەنگە لە هەمو سەرەباسەکانی ڕێزماندا توێژینەوەی وەها سەراوتی بەکار بێ و بەکار هاتبێ .. با ئەم ڕوپەڕەیە لێرەدا وەرگێڕین و چی تر بە دوای نەکەوین چونکە ئەوە ناهێنێ یەك هەنگاوی تری بۆ هەڵێنین .

هەندێك لە زمانزانان ڕاناوی « م » لە ڕستەی وەك « من پاکم » بە فیعل دادەنێن ، واتە بەلای وانەوە هەمو ڕاناوە لکاوەکان لەو ڕستانەدا کە بێ فیعلن خۆیان فیعلەکەن و کاتی « ئێستا ، حاضر » دەبەخشن . ئەم تاقمە دەڵێن « میم » ی ڕستەی « من پاکم » وەك « am » ی زمانی ئینگلیزی وە یا « sui » زمانی فرەنسی وایە کە حاڵەتێکی « فعل الکینونة ، Verb to be » یە واتە ئەو وشانەی کە بە ڕاناو دادەنرێن لە ڕستەی « من پاکم ، ئێمە پاکین ، تۆ پاکی ، ئێوە پاکن ، ئەو پاکە ، ئەوان پاکن » دەبێ صیغەی ئێستاکەی فیعلی « بوون ، کینونە » بن ، گۆیا ڕابردوی « من پاك

بوّم » داهاتو « من پاك دەبم » بێ .

ئەم باوەڕە نەختێك لە باوەڕەكەی پێشوتر كاملترە لەو رووەوە كە هەر نەبێ وەك كەسێك لافاو رامالّی دابێ دەیەوێ دەست بە پنچكێك وە یا لكە دارێكەوە بگرێ . بەلاّم بە داخەوە ئەویش لەلای خۆیەوە كارێك دەكا بە زمانەكەمان یا بە دەواری شڕی نەكردبێ .

كە گوترا ئەو « میم »دی كۆتایی رستەی « من پاكم » فیعلە نەك راناوە ، ئەوسا دوچاری مەتەلّی ئەوتۆ دەبین لە زمانەكەماندا بە كەس هەلّنەیێ ، چونكە راستەوخۆ بەو حەقیقەتە رەق و تەقە دەكەوینەوە كە هەمان « میم » لە كۆتایی فیعلیشەوە دێ وەك « گوتم ، رۆیشتم ، دەبینم ، بكەم . . » بەو پێیە دەگەینە ئەو ئەنجامە كە لە كوردیدا یەك « فعل » دوو فیعلی تێدایە كە ئەمە خۆی لە خۆیدا گەپێكی سەیرە ، ئێسكیشی سوك نیە ، ئینجا تێدەمێنین بەدەست ئەو «استحالە»وە كە بە كەس ناكرێ لە رستەی «رۆیشتم»دا واتای فیعل بەسەر ئەو « میم »ە بێ گوناهەدا بسەپێنێ ، ئەوساش « میم »ەكە دەبێتە « فعل و نافعل » . لەوەش سەیرتر حالّی « میم »ەكەیە كە دەبێتە « مضاف إلیه » وەك كە بلّێی « بارامی كوڕم » لێرەدا هەر بە جارێ یەكی هۆش و گۆشی هەمو زمانزانینێكمان دەكەوێ چونكە لە « اضافە »دا چ پێویستیێكمان نیە بە فیعل . خۆ ئەگەر هات و گوتم « من براتم » ئەوسا « تێ »یەكەو « میم »ەكە هەردو كیان ، خۆشی بێ و ترشی بێ ، دەبنە « فعل » هەرچەند ئیمكان نیە بە شرینقەش واتای فیعلیان تێ بكرێ . دەمێنێتەوە بلّێین ئەو « میم »ە و هاوڕێكانی هەر لە حالێكدا

به فیعل دادەنرێن کە لە رستەدا فیعلی بەرچاو نەبێ ، واتە کە گوتمان « من کوڕم » لێرەدا « میم » ەکە فیعل بێ تاکوو رستەکە نەبێتە رستەی بێ فعل ، کە گوتیشمان « بارامی کوڕم ئەمەتە ! » با لێرەدا « میم » ەکە راناو بێ یا هەرچی دەبێ با ببێ هەر فیعل نەبێ ، بەو گوێرەیە دڵمان تەسکین دەبێ بە نەهێشتنی « تناقض » و بێ مەنتیقی لە بڕیارو دەستوور و لێکدانەوەی زمانزانیمان . خولاسـە بۆخاتری سەپاندنی بوونی « فعل » لە هەموو رستەیێکی کوردیدا پێویستمان هەیە بەهەندێك چاوپۆشی و لە بیرخۆ بردنەوە و هۆش خەواندن ، ئەگەر وانەکەین دۆچاری ئەوە دێین کە دان بنێین بە بوونی رستەی بێ فیعل لە زمانی کوردیدا ، ئەوساش مەبدەئە پیرۆزەکەی « هەموو زمانەکانی هیندی — ئەورووپایی هەر رستەی بە فیعلیان هەیە » کەلێنی تێ دەکەوێ ، یاخود هەر بە جارێ سەرەوبن دەبێ ، ئیتر لەوە بەولاوە خوا دەزانێ کورد و زمانی کوردی چیان بەسەر دێ . . . ! !

بە دەست خۆم نیە لێرەدا بە نیسبەت لەناوچوونی ئەو مەبدەئەوە قسەی کابرای شارەزووریم بە بیردا دێ کە گوتی « دەمرێ نامرێ ملی وەقوتەوە » .

زمانی کوردی نە زیاد دەکا نە کەم دەکا بەوە کە هەموو دەستوورەکانی لەگەڵ هەموو زمانەکانی هیندی — ئەورووپایی رێك بکەوێ یا رێك نەکەوێ . من تەعەصوبێکم نیە ، نە بە لایەنگیری نە بەدژکاری ، بۆ هەر راستییێك کە لە توێژینەوە دەربارەی زمانەکەمان ئاشکرا دەبێ ، تەعەصوبێکم کە هەبێ بۆ راستییەکە خۆیەتی .

من وا لەبەرچاومە هەر هەمان راناوی لکاو کە بە دوا فیعلدا دێ لەکۆتایی ئەو رستەیەش دێ کە فیعلی بەرچاوی تێدا نیە ، ئینجا دەبێتە « مضاف الیه » و کاراو بەرکار و بەدوا ئەو ئەمرازانەشدا دێ کە پێیان دەگوترێ « Preposition » :

من هاتم ،

من کوڕم ،

دارای کوڕم هات ،

لێم گەڕێ ،

پێم بڵێ ،

بمبینە ،

دەتاندیتم ،

مەخەرە هاویەیی هەولی فیراق ،

دەستم تێ‌مەدە هەر خۆم ئاگرینم .

لە هەمو رستەکاندا « میم »ەکە وەك خۆی دێتەوە بێ ئەوە زەررەیێك لە واتاو سروشت و تایبەتیەکانی زیاد و کەمی کردبێ ئیتر بە چ مافێك و ئینسافێك بە مرۆڤی کورد بڵێم : براکەم ئەم « میم » ە لە فلانە رستەدا شتێکی جیاوازە لە « میم »ەکانی تر ، خۆئەگەر قەناعەتیشت نەبێ ، کاکی کورد ، دەبێ لەبەر خاتری من خۆت ئیقناع کەی . . .

بە راستی ئەمە کاری کردن نیە .

دوای ئەمە سـەر لەنوێ دەبێ خۆم و خەلقیش هەڵفریوێنم بەوە کە بڵێم ئەم « میم »ەی رستەی « من کوڕم » هەمان « am »ی « فعل الـکینونە »ی « I am a boy »ە هەروەهاش دوَ پیتی « ین » لە رستەی « ئێمە کوڕین » « فعل الـکینونە »ی ( are )ە لە رستەی « We are boys »دا .

وەی کە دوَر دەکەوینەوە لە جەرگەی زمانی کوردیَ و خۆمان لە تایبەتیەکانی کوێر دەکەین بە قسەی ئەوتۆیی .

لە ئینـگلیزیدا ئـەم « is , am , are »ە بە راستی « فعـل الـکینونە ـ Verb to be »ن و « تصریف » دەکرێن و لە « ماضی »دا دەبنە « was , were » :

I am
I was
We are
We were
He is
He was

راناوە لکاوەکانی کوردیَ ئەم « تصریف و ماضی و مضارعە » یان نیە چـونکە فیعل نین تا هەیانبێ . رێکەوت وایە راناوی کەسی یەکەم لە کوردیدا کە « میم »ە نەختێك لە « am »ی ئینـگلیزیَ دەچێ خـۆ هەمو راناوەکانیتر زۆر و کەم پێك چوَنیان نیە لەگەڵ « am , is , was , Were » . کە دەڵێی « ئێمـە کوردین » چ

شەباهەتی تێدا نیە لەگەڵ رستەی « We are Kurd » ، واتە راناوی « ین » لە کوێ و فیعلی « are » لە کوێ . هەر راناوی « میم » خۆی چ ناشوبهێتە « sui » کە « فعل الکینونە » ی کەسی یەکەمی تاکە لە فەرەنسیدا ، خۆ فەرەنسیش وەك ئینگلیزی و کوردی یەکێکە لە خێزانەکەی « هیندی ـ ئەوروپایی » .

لە ئینگلیزیدا راناوی لکاو نیە وەك لە کوردیدا هەیە ، تەنانەت هەمو فیعلەکانی یەك صیغەیان هەیە بۆ هەمو کەسەکان ، تەنها لە « مضارع » ی کەسی سێیەمی تاکدا پیتێکی « S » دەلکێ بە کۆتایی فیعلەکەوە . تۆ سەیر کە کە دەڵێی « I was » راناوێکی نەلکاو و فیعلی « کینونە »ت بەکار هێناوە ، بەڵام لە کوردیدا کە دەڵێی « من بوم » راناوی نەلکاوی « من » و « فعل الکینونە » ی « بو » و راناوی لکاوی « م »ت هێنا دەوجا کە « م »ەکە بۆخۆی « فعل الکینونە » بێ ئەی فیعلی « بو » دەبێ چی بێ ؟

بوختەی قسە لە سەرلەبەری ئەم مەوزوعە رادەگەیەنێ کە وا لە رستەی وەك « من پاکم ، لێمزا دیارە ، تۆ برای منی ، هەموتمان کوردین ، سەیری[10] چەند جوانە ، دارا کوڕی رۆستەمە ، ناوی سالم عەبدوڕڕەحمان بەگە ، رەواندز بەسەر خەرەندەوەیە . . . » و هەزاران رستەی ئەوتۆیی لە زمانی کوردیدا نە هیچ فیعلێکی نهێنی

---

(١٠) بە ئانقەست ئەم رستەیەم هێنا تا بڵێم دەشێ لێرەدا فیعلێکی قرتاو هەبێ و بە ئەسل « سەیری کە » بوبێ ، بەڵام « چەند جوانە » بۆ خۆی بێ فیعلە .

تێدایه نه عەقڵ دەسەلمێنێ ئەو بەشەی پێی دەگوترێ « راناو » له رستەکاندا فیعل بن چونکه هەروەك مراوتی کەرکەددن نیه ئەمانەش فیعل نین ، که به زۆره مله‌ش کردمانه فیعل هەرچی دەستوری بنجی هەیه بۆ پێکهێنانی رستەی تەواو له کوردیدا لەگەڵ هەوەڵ تەکانی ئەم زۆره ملەیەدا پەرەم به پەرەم دەبێ و زمانی کوردی ئەوه نامێنێ که هەیه ، دەبێ رێزمانێك ساز دەین ئەوەنده پڕ فەند و فێڵ و ساخته و تەئویل بێ بابی ئەوه بکا هەر نەبێ له رواڵەتدا پەردەیێکی درۆزن بخاته سەر ئەو هەمو ئیعتیرازانه که دێنه سەری و رێی پێ دەگرن . به نمونه ددڵێم که گوترا راناوکاەن فیعلن ئەوسا دەبێ تەعریفی فیعل دەسکاری بکرێ تا ئەوانیش بگرێتەوه ، تەئویلیش بێتەوه بۆ نەبونی ئاوەڵکار « ظرف »ی ئەوتۆ لەگەڵ واندا بگونجێ ، شەوەدها و رۆژەهاش خەریك بین تەوجیهێك بێنینەوه بۆ گۆڕانی ئەو وشانه له راناوەوه بۆ فیعل ، له فیعلەوه بۆ راناو و له خەلق بگەینین چۆن « میم »ی رستەی « من پاکم » فیعله و هی رستەی « رۆیشتم » راناوه .

ج سەرپێچی پێ ناوێ ، لزوم به دوَ دلیش ناکا لەوەدا بێ پەروا و به قەناعەتێکی تەواوەوه بڵێین رستەی بێ فیعل له کوردیدا هەیه وەك رستەی فیعلدار : ئەوەی ئیمکانیشی پەیدا کردوه رستەی بێ فیعل هەبێ راناوه لکاوەکەیه به خۆی و توانای زۆر سەرییەوه بۆ دروست کردنی « حکم ، اسناد » له رستەدا . له کوردیدا راناوی لکاو ئەوەنده کاریگەره نەك هەر له رستەی بێفیعلدا « اسناد ، حکم » هەڵدەستێنێ ، فیعلیش ، به دەگمەن و له هەندێ

صیغەی تایبەتی نەبێ ، بێ راناوی لکاو کار ناکا بە تایبەتی لە لەهجەی کوردستانی ژێرۆدا کە وا خەریکە خۆ دەسەپێنێ وەك شێوە زمانی ئەدەبی کوردێ . زمانزانێك کە سرنج بگرێ لە بەشەکانی زمانی کوردێ و رۆلی هەر بەشە لە ئاخاوتندا بێنێتە بەر هەست و هۆشی خۆیەوە زوَ لەوە دلْنیا دەبێ کە وا رستەی بێ فیعل هەیە و پڕی زمانی کوردییە ، سەر لە نوێ پرسیارێکی‌تریش لە خۆی دەکا و دەڵێ ئایا دەشێ لە کوردیدا رستەی تەواوی بە « اسناد » پەیدا بێ بێ راناوی لکاو ؟ بەلامەوە لێرەشدا قەناعەت پەیدا دەکا بەوە کە وا هاتنی راناوی لکاو بۆ ناو رستەی بە « اسناد » دەستورێکی بنجی و گشتییە لە زمانی کوردیدا ، تەعلیلێکیش پێویست دەبینێ بۆ نەبوونی راناوی لکاو لە زۆرینەی فیعلی کەسی سێیەمی تاك و لە صیغەی « فەرمان ، أمر ، طلب ، ویستن » بۆ کەسی دوەمی تاك . دەبێ پرسیارێك لە خۆی و سروشتی زمانەکەی و مەنتیقیش بکا هۆی نەبوونی راناو لە فیعلی وەك « هات ، فڕی ، رما ، مرد — بڕۆ ، وەرە ، بلێ ، بخۆ ، بڕێ » چیە و بۆ ئەم فیعلانەی کەسی سێیەم و دوەمی تاك بێ راناون ؟ هەوڵ دەدەم لەم نوسینەمدا ، ئەگەر زێدە لە تەحەمولی بارستی گوتار درێژ نەبێتەوە ، بەپێی تێگەیشتنی خۆم وەرامی ئەم پرسیارە بدەمەوە .

نوسەرم دیوە لە کوردیدا بەئاسایی و بێ خۆ ماندوَ کردن و بەلگە هێنانەوە گوتوەتی ئەم بزوێنەی کۆتایی رستەی وەك « دارا مەردە » کە دەبێتە هۆی «اسناد» لە رستەدا هەمان فیعلی

« کینونه »یه که له فارسیدا به وشەی « است » دەردەبڕرێ ، ئەوەشی خستۆتە سەر قسەکانیەوە بۆ پتەو کردنی باوەڕەکەی که وا له هەندێ شێوەی کوردێ رستەکه به تەواوێ خۆی له فارسی نزیك دەکاتەوە و دەبێتە « دارا مەردەس » . زمانزانێك که لەبەر تیشکی چاو غەڵەتێنی « دارا مەردەس » بگا بەو قەناعەتە کە لەو جۆرە رستانەدا کورد و فارس « مەردە ، مەردەس — مرداست » یان له یەك سەرچاوەوە هەڵێنجاوە دەبوا پرسیارێك له خۆی بکا و بڵێ له فارسیدا ئەم « است » ە هەر بۆ کەسی سێیەمی تاك بەکارنایێ ، بۆ هەمێ کەسەکان بەکار دێ و دەگوترێ « مرداستیم ، مرداستم ، مرداستی ، مرداستید ، مرداستند ، مرداست » ئەدی بۆ له کوردیدا هەر بۆ کەسی سێیەمی تاك ، ئەویش له هەندێ لەهجەکانی ، ئەم « است »ە تارمایییکی دەدیترێ ؟ بۆ ناگوترێ « من مەردەسم ، تۆ مەردەسی ، ئێمە مەردەسین .. » ؟

لێرەدا پەردەیێك لەسەر مەوزوع هەیە دەبێ لابرێ ئینجا خۆی بەدەستەوە بدا .

له فارسیدا که بڵێی « منم — به ئیملای کوردێ مەنەم دەنوسرێ » وەك ئەوەیە له کوردیدا بڵێی « منم » : که گوتیشت « من هستم » ئەم گوتەیە له کوردیدا دەبێتە « من هەم » . ئەم صیغەیەی « منم — مەنەم » بۆ هەمێ کەسەکان بەکار دێ وەك خۆڵێ ، تەنها بۆ کەسی سێیەمی تاك نەبێ . دەڵێی « منم ، توئی ، مائیم ، شمائید ، ایشانند » بەلام بۆ کەسی سێیەمی تاك دەبێتە

« اوست — دیاره کورت کراوەی أوهست »ە .

صیغەکەی تریش هەروەها بۆ هەمو کەســـەکان دێتـــەوە و دەگوترێ : « من هستم ، ما هستیم ، تو هستی ، شما هستید ، أو هست ، ایشان هستند » .

کوردیش وەك فارسی هەر دوَ صیغەی هەیە :

منم ، ئێمەین ، تۆی ، ئێوەن ، ئەوە ، ئەوانن .

من هەم ، ئێمە هەین ، تۆ هەی ، ئێوە هەن ، ئەو هەیە ، ئەوان هەن .

لەمەڕا دیار دەکەوێ کورد کە دەڵێ « دارا مەردە » رستەیێکی کوردیی پەتی بەکارهێناوە ، ئەمرازێـکیشی[11] بۆ دروستـکردنی « حکم و اسناد » ەکە هێناوەتەوە کە نەك هەر کوردییـە و بەس بەلـکو یەکێکە لە دوَ صیغەی کوردیی رەسەن کە تا ئێستاش بە جوَتە زیندوَن و هەر یەکەیان کارێـکی تایبـەتی دەکا . بەو پێیە « دارا مەردە ، مــن مەردم » لە « دارا مرداست ، من مرد استم » وەرنەگیراوە ، لەو دوَ رستەیەی کوردیش وەرنەگیراوە کە گوترابا « دارا مەرد هەیە ، من مەرد هــەم » ، زۆر ئاشکرایە راناوەکانی « ە ، م » شتێـکی جیان لە « هەیە ، هەم » . راستییەکەی « هەیە و هەم و هەین و هەن .. » بەولای « حکم و اسناد » ی «مطلق» شتێکی

(11) مەبەستم ئەو بزوێنـەی « ە »یە کە لە کۆتایی رستەکەدایە « دارا مەردە » ، بەلای منەوە بزوێنەکە جێـگەی « راناوی لـکاو » ی گرتۆتەوە .

بەزیادەوەیان تێـــدایە کە واتاکەیان راســتەوخۆ دەکاتە « مەوجودە ، مەوجودم ، مەوجودین . . . » .

بەڵام لێرەدا رۆن کردنەوەیێك پێویستە بێ درێژە پێـدان ، چونکە نە ئەو دەرفەتە هەیە نە ئەو تۆژینەوە کراوە رێی درێژ کیشانەوە بدا .

لە فارسیدا صیغەی « هستم ، هستیم » هەر بۆ حاڵی حازر هەیە نە لە رابردوَ ، نە لە « مضارع »دا پەیدا نابێ . لە «ماضی»دا دەبێتە « بودم » لە «مضارع»دا دەبێتە « میشوم » .

لە کوردیدا بەنیسبەت مەوزوَعەوە دوَ تێبینی دێتە پێش :

١ — « هەم ، هەین.. » « ماضی »شیان هەیە ودەگوترێ « هەبوَم ، هەبوَین ، هەبوَی ، هەبوَ ، هەبوَن ، هەبوَن » . لە تصریفەکەشدا دیارە فیعلەکە تێنەپەڕە ، چونکە راناوی تێنەپەڕی بۆ بەکارهاتوە ، خۆ لەگوێرەی واتاکەی هەر ئەمەیش چاوەڕوان دەکرا .

٢ — فیعلی « هەبوَن » بە واتای « تملّك »یش بەکار دێ ، بەڵام ئەوسا جۆری لەکارهێنان و تەصریفی دەگۆڕێ . بۆ حازر دەگوترێ « هەمە ، هەمانە ، هەتانە ، هەیەتی ، هەیانە » .

هەمیسان بۆ حازر دەگوترێ « هەیەتم ، هەیەتمان ، هەیەتت هەیەتتان ، هەیەتی ، هەیەتیان » . لێرەدا وەك ئەو صیغەیەی لێ کرا کە دەڵێ « کردوەتم ، کردوەتمان ، کردوەتت ، کردوەتتان » کە بە واتای « کردوَمە ، کردوَمانە ... » دێ لە زاری خەلقی سولەیمانی . دەشدیترێ بۆ کەسی سێیەمی تاك بۆ هەردوَ وێنە هەر صیغەی « هەیەتی » بەکاردێ .

لە «ماضی»دا دەگوترێ « هەمبو ، هەمانبو ، هەتبو ، هەتانبو ، هەیبو ، هەیانبو » .

لە «مضارع»دا دەگوترێ « دەمبێ ، دەمانبێ ، دەتبێ دەتانبێ ، دەیبێ ، دەیانبێ » .

ئاشکرایە بەکارهێنانی « هەبون » بە واتای « تملك » دەیکاتە کاری تێپەڕ « متعدی » ، بە پێچەوانەی ئەوە کە بە واتای « مەوجودم » بەکار بێ ئەو فیعلی لەگەڵیدا دێ دەبێتە تێنەپەڕ ، وەك گوتمان .

تۆ کە دەڵێی « من هەم ، من هەبوم ، من دەبم » بە واتای مەوجودم ، مەوجود بوم ، مەوجود دەبم ، وەك ئەوەیە گوتبێتت « من نوستوم ، من نوستم ، من دەنوم » کە تەصریفی کارێکی تێنەپەڕە .

بەڵام کە دەڵێی « هەمە ، هەمانە » صیغەی « گوتومە ، گوتومانە »ت بەکار هێناوە کە هی کاری تێپەڕە . لە کاری تێنەپەڕدا ناگوترێ « نوستومە ، نوستومانە . . . . »

کە دەشڵێی « هەیەتم ، هەیەتمان » صیغەی « گوتوەتم ، گوتوەتمان »ت بەکارهێناوە کە ئەویش هی تێپەڕە.

لە «ماضی»دا کە دەڵێی «هەمبو ، هەمانبو » لە راستە «تصریف»ت لاداوە چونکە وەك ئەوەنیە بڵێی « کردم ، گوتم » ، بەڵام لەبەر هۆیێکی گرنگ ئەم لادانە کراوە : ئەگەر وەك « کردم و گوتم » کرابایە «ماضی» ئەوسا دەبوە « هەبوم »کە تێنەپەڕە و واتای «تملك» دانا ، واتای «مەوجود بوم » دەدا . بۆیەیە کە دەڵێی « هەمبو ،

هەمانبێ » ئەوەت کردوە کە لەگەڵ فیعلی تێپەڕی خاوەن پێشگری دەکەی : دەڵێی « هەڵم‌گرت ، دەرم‌کرد ... » ، ئەگەر فیعلەکە تێنەپەڕ بێ دەڵێی « هەڵستام ، دەرچوم » .

لە «مضارع»یشدا کە دەڵێی « دەمبێ » « مضـارع »ی عادەتیت نەهێناوە وەك « دەخۆم ، دەبینم ، دەخۆین ، دەبینین » چونکە ئەگەر واتکردبا دەبوا بڵێی « دەبم » کە وا بە واتای تێنەپەڕ دێ و «تەمەلك»ی تێدا نابێ . « دەمبێ ، دەمانبێ » وەك فیعلی « دەمانپەرژێ ، دەمانخورێ ، دەماندزێ[12] ، دەمانەوێ » وایە کە فیعلی تێپـەڕن ،

---

(١٢) دەمدزێ : لە دزینەوە نەهاتوە ، بە ئەصـل لە وشـەی ( دزێـو ) وەرگیراوە ، دزێویش بە واتای ( ناشیرن ) دێ ، کەواتە دەمـدزێ « پێم دزیوە ــ یقرزني » بە ئەوەی راستی بێ ئەم کۆمەڵە فیعلـە ، میتریش هەن ، لە کوردیدا سروشتی تایبەتی خۆیان هەیە و مامڵەتیان لە هەندێ رووەوە لە فیعلی‌تر جودایە وەك ئەوەی کە لە «ماضي»دا راناوە لکاوەکانیان «فاعل»ەو و لە «مضارع»دا دەبێتە مەفعوڵ : « بەرزام ، دەمپەرژێ ــ دزام ، دەمدزی ــ ویستم ، دەمـەوێ » . بە سـەهۆ مەچۆ لە راناوەکەی فیعلی دەمەوێ بەوەدا کە وەك فاعیل بێتە پێش چاوت : راناوی لکاو لە «مضارع»دا نایێتە دوای نیشانەی «دە»ی مضارعەوە بە مەفعوڵی نەبێ وەك «دەمنوسێ ، دەمبینێ ، دەمکا، دەمخوا .. » فیعلی «دەمەوێ» واتاکەی دەبێتە « یعوزني » هەرچەند لە رابردودا «ویستم» بە واتای « طلبت ، أردت »ش بێ .

سەیرێکی فیعلی « دەمخورێ » بکە ، هەرچەند لە رابردودا « خورام » تێنەپەڕە و چ مەفعوڵی بێ ناوێ ، لە «مضارع»دا راناوەکەی «م» بوە بە مەفعوڵ بەپێی دەستور دەبوا بۆ دروست کردنی فیعلی تێپەڕ لە «خوران» =

بەڵام راناوە لـکاوەکەیان « مانِ » هەرچەند هی فیعلی تێپەڕە ، لێرەدا جێگەی « مفعول »ی گرتۆتەوە .

ساغ کردنەوەی ئەو باسانە گەلێك پتری دەوێ لەوەندەی من لەسەری ڕۆیشتم ، بەڵام بێ گومان لە پەراوێزی گوتارێکدا هەر هێندەی جێ بۆ دەکرێتەوە . خۆ ئەوەی راستی بێ دەبوا بە جۆرێك خۆمیان لێ بدزمەوە باسەکەش ناتەواو نەبێ و قازانجی « کورت کردنەوە »ش پێك بێ ، بەڵام لەو دەربتونەی تێیدا ڕۆیشتم بۆ سەرشار و ناوەرۆکی گوتارەکە ، لوت و بزوت توشم هات و پێم نەکرا خۆمی لەبەر لادەم تا باجی خۆی لێ سەندم . مەبەسم لەو تێبینیە « هەمە و هەیەتم »ە نەك باسەکانی تر کەوا لە جەرگەی مەوزوعەوە هەڵدەستن .

تا ئێرە کارێکی کردبێتم و گوتەیێکی گوتبێتم ، بە زۆرێ ، رەخنە و راست کردنەوە و پێ رازی نەبون بوە ، لە دوو لێوەی خامەم دەرنەچو « ضمیر ، راناو ، Pronoun » چیە و چەندە و چۆنە . بەڵام وەنیە لەوەدا سوچی من هەبێ ، مەوزوع لە خۆیەوە پەل داوێ بە هەمو لایێکدا و گەلێك دەفتەران دەخوێنتەوە ،

---

=هەر خوراندن هەبێ و بگوترێ « خوراندمـی ، دەمخورێنێ » کەچی وا لە « مضارع »دا مامڵەتی بەتەواوی هی تێپەڕە بە بێ زیاد کردنی باشگری « اندن » . مەوزوع پتری بە بەرەوە هەیە و پێویستی بە (استقراء)یش زۆرە . بەلام لێرەدا جێی نابێتەوە ، جێگاکە خۆی جی تری بەبەرەوە نیە .

تەنانەت وابوە من دەفتەرم لێ داخستوە دەنا درێژتریش خۆی لێك دەكێشایەوە .

لەو رۆپەڕنەی وا بەدەستەوە ماون لە گوتارەكەدا دێمە سەر چەقی باسەكە و هەوڵ دەدەم ، بەپێی تێفكرینی خۆم ، وەرام بدەمەوە :

لە كوردیدا « راناو » چیە ؟

راناو چەندن ؟

راناو چ كارێك دەكەن ؟

پێشتر گوتم لەو لیستەی حەفت لكاوییە ، شەش لكیان راناو نین . هەڵبەت كە دەڵێم راناو نین لەو روەوەیە كە وا لكی حەفتەم « راناوی كەسی » كە لە ئینگلیزیدا پێی دەگوتری « Personal » ئەو راناو بێ ، چونكی هەرچی هۆی كۆكردنەوە و لە یەك چواندن و خزمایەتی هەیە لە بەینی راناوی كەسی و شەش بەشەكەی تردا نیە . لە فەرزی لە رێی تەعریفێكی فش و فۆڵی راناوەوە بشتوانین جغزێكی پان و شل و شەپەتە بە دەوری هەمواندا بكێشین ئەو جغزە هەر وەك ئەو خەندەقەی لێ دێ كە بە دەوری ئاو و ئاگرەوە هەڵكەندرابێ : صەد جاران بڵێی « ئاو و ئاگر مادەن » دژایەتی و « تناقضی »ی میانیان بەو قسەیە هەڵناستێ . ئەگەر بە وشەسازی و فەندی رەوانكاری چاری «تناقضات» كرابا دەمانگوت « داگیركەر و داگیركراو هەردوێان ئادەمزادن » و بە وە لە هەرا و هۆریا و شۆرش و كشتوبڕی دەبوینەوە . هەر تەعریفێك

بێ و راناوەکانی « گوتمان ، دەڵێین » کۆبکاتەوە لەگەڵ وشەی وەك « ئایا ، هیچ کەسێ » ئەو تەعریفە لەوەی زیاتر نەکردوە کە خۆی ئاوس کردوە بە شتی وێك نەچوی وەك « هێلکە مراوی و خاکەناز و متوی ساختەی باروکا » . پێشتر گوتم و ئێستاش دەڵێمەوە کە زمانزان یاسا و دەستوری وەها دانێ راناوی « میم » لە رستەی « کردم »دا بەر ئەو تەعریفە بخا کە بۆ « فلانەکەس و فیسار » دانراوە ئیتر پێی ناوی (اسم و فعل و ظرف و صفە) ش لە یەکدی جودا کاتەوە : شاعیر گوتەنی « زەحمەتی بێهودە چ لازم » .

من لێرەدا رێی بەخۆم نادەم ، دەرفەتیش نیە ، بچمە ئەو بنج و بنکە فکرییەوە کە بیروباوەڕی زمانزانانی لەسەر هەڵچەقیوە دەربارەی تێکڕای دەستورەکانی ڕێزمان یا تایبەتی دەستوری سەر بە راناو کە یەکێك بێ لە بەشەکانی ئاخاوتن : ئەم کارە نە دەکرێ و نە پێویستە . لێرەدا هەر هێندە ماوەی قسە و توژینەوە هەیە کە بایی هەڵسەنگاندنی ئەو زۆرخانە ئاشکرا و دیارە بکا کە لە کتێبان نوسراوە و بە سەر زار و زمانانەوەیە .

ئەو شەش بەشەی راناو کە دەمێنێتەوە دوای دەرهاویشتنی راناوی کەسی لە لیستەی حەفت کەرتی ، بەلای منەوە ، ئەوانیش کۆنابنەوە لەژێر ناونیشانی « راناو » یا هەر عینوانێکی تر بێ چونکە زۆر لەو بەشانە هێند لە یەکدی دوورن ئەگەر رواڵەتێکی بێبایەخیش خزمایەتییان لە میاندا پێك بێنێ ، جودایی وەها بەهێز لە یەکدییان دەترازێنێ کە نەشێ هەرگیز لەتەك یەکترا دابنرێن و بە تیرە و

هۆزیك حیســـاب بكرێن . سرنج بدە ئەو « ی »ی رستەی وەك « پیاوەكەی هاتە لام » و بیخە تەك وشـــەی « هیچ كەس » و خۆ خەریك كە بە دۆزینەوەی شەباهەت و لە یەكدی چون لەبەینیاندا . بێ لە گەمە ئەم دوَ وشـەیە هەر ئەوەندە لە یەكدی دەچن و خزمن لەگەڵ یەكتر كە هـەریەكەیان وەك ئەوی‌تر بریتییە لە پیتی «ئەلف و بێ » و لە ئاخافتندا دەورێـكی هـەیە ، لەوە زیاتر هیچ تایبەتییێكی « مشترك » كۆیان ناكاتەوە . ودك ئەم دوَ وشەیەش وشەی « هی » لە رستەی « جلـكەكە هی دارایە » و وشـــەی « یەكێك » لە رستەی « یەكێك هـــات بۆ ماڵەكەمانـــ » ئەوانیش هێندی هەمۆ جۆتە وشەیێكی لە یەكتر بێـگانە بێـگانەن . وشـــەی « هی » واتایێـكی رۆنی « تمَلك » دەبەخشێ ودك وشەی « of » لە ئینـگلیزیدا ، هـەر ئەوەندە فەرقەش هەسـت پێ دەكرێ لە بەینیانـدا كە جۆری بەكار هێنـانیان لە دوَ زمانەكەدا لە یەكتریان جودا دەكاتەوە . وشـــەی « یەكێك » بە لەفز و واتاوە تەواو و سەربەخۆیە .

خولاسەی قسە ئەوەیە كە وشـەكانی « من ، ئێمە ، ئێوە ، تۆ ، ئەوان ، ئەو » بە خۆیان و شێوە لكاوەكانیانەوە راناو بن رێگە دەبەسترێ بە تەواوی لەوە ئەم عینوانە بۆ هیـچ بەشـێكی تری ئاخاوتن بەكار بێ .

بەڵام تۆ بڵێی كە ناوی راناوت نەكردە عینوانی ئـــەم تاقە وشەیە ئایا عینوانی راناو دەست دەدا بۆ شەش كەرتەكەی‌تر ؟ بێ ئەوە بچمە ناو درێژە پێدان و خورد كردنەوەوە ، بەلای باوەڕی منەوە ، ئەم چەند تێبینییانەی خـــوارەوە بەقەدەر « بدیهیە » دێنە بـــەر

هەست و سرنجی مرۆڤ دەربارەی کۆمەڵە وشەی لیستەی شەش لکاویەوە :

١– عینوانی « راناو » دەست نادا ، نە بۆ تێکڕای لیستەکە نە بۆ هیچ یەکێك لە لکەکانی .

٢– ئیمکان نیە هیچ عینوانێکی تر ئەم کۆمەڵە وشەیەی لە یەکتر نەچووی پەرا گەندەی بێسنوور و پەراوێز بخاتە ژێر سایەی خۆیەوە .

٣– گەلێك لە وشەکانی یەکێك لە لکەکان بۆ خۆیان ناچنە ژێر تاکە یەك عینوانەوە و دەبێ دابەش بکرێن بەسەر چەند بەشێکی ئاخافتندا .

من لێرەدا ماڵئاوایی یەکجارەکی دەکەم لەم شەش لکەی لیستەی راناوان و چ رۆپێوی تری ئەم گوتارەیان پێ ناگرمەوە ، مەگەر ناوناوە موناسەبەیێکی ناچاری بیانهێنێتەوە ناو باسەکە ، چی ماوە لە مەودای نوسین لە قەبەڵ ئەو تاقە وشەیەی دەکەم کە لە لیستەکەدا « راناوی کەسی » بۆ بەکار هاتبوو .

## راناوی کەسی ؟

وەك لێتەوە دیارە ، بەرلەوەی بچمە ناو لێکۆڵینەوە و ڕوون کردنەوە ، عینوانی « راناوی کەسی » بەلای قەناعەتی منەوە پرسەك « علامة سؤال » یکی گەورەی بەسەرەوەیە ، واتە هەر لە پێشەوە

بەم عینوانە رازی نیم خۆ بکاتە روانگەی تێوەڕامان لەم کۆمەڵە وشەیـە .

عینوان و ناو و نیشان کە دادەنرێ بۆ هەر باسێك وای لێ چاوەڕوان دەکرێ چەنـد مەبەستێکی بنجی جێ بە جێ کـردبێ وەك :

١— ڕێ نەدا بە هاتنە ناوی غەیری باسی ئەسلی بـۆ ناو جغزی عینوانەکە ، کەچی وشـەی « کەسی » کوێـرە ڕێیانیش نابەسـتێتەوە لە ڕوی وشەی وەك « کێ » کـە راستەوخـۆ و بێ کینایە و تەئویل لە هەمو کەسان کەسترە و بـێ سـێ و دوَ قـوت دەبێتەوە لەسەر چـەقی واتای « راناوی کەسی » . لە وشـەی « کێ »ش واز بێنە سەیرێـکی وشەی « ئەمە » بکە : لەبەر تیشـکی واتای « راناوی کەسی » دا چ فەرقێك هەیە لە میانی « ئەمە دارایە ـ ئەو دارایە ؟ » ، بە راستی کوردی گوتەنی ، درۆزن نەبـێ فەرقیـان پێ نا کا .

نەخێر ، زاراوەی « راناوی کەسی » شتورەیێکی هێندە بـڵند راناکێشێ بە دەوری مەبەستدا کە نەهێڵێ وشەی بێگانە بەسەریدا بازدا بۆ ناویەوە .

٢— هەمو کەرت و بەشەکانی باسەکە بگرێتەوە بەهۆی واتای عینوانەکە خۆیەوە نەك لە ڕێی تەئویل و یارمەتی دانەوە .

کە ئەمە بکەین بە کێش و تـەرازوی هەڵسەنگاندنی زاراوەی « راناوی کەسی » دەبینین زاراوەکە لە زۆر ڕووەوە کـورت دێنێ :

پێشتر گوتم وشەکانی « من ، ئێمە » بە هیچ جۆرێك نـاچنە جێی ناو ، ئیمکانیش نیە ناو جێیان بگرێتەوە ، کەواتە زاراوەی « راناو » بۆ ئەمان دەست نادا چونکە بەر واتای راناو ناکەون . دوو وشـەی « تۆ ، ئێوە »ش لەو رووەوە وەك « من ، ئێمە » وان . بە راستی وشەکانی « ئێمە ، من ـ ئێوە ، تۆ » راناو نین بەڵام « کەس »ی تەواون . کە سرنج بدەین دەبینین وشەکانی « ئەو ، ئەوان » دەشـێ پێیان بگوترێ « راناو » چونکە جێی ناویان گرتۆتەوە ، بـــەڵام وەنیە هەمتو جاران دەلالەتی « کەس »یان هەبێ وەك کە بڵێی « مـن مێشوولەکەم نەکوشت ، ئەو لە خۆوە مرد » . بـــەو پێیە مەعـلوم دەکرێ کە « من ، ئێمە ، تـۆ ، ئێوە » کەسـن و راناو نـین ، « ئەو ، ئەوان » راناون و هەمتو جاران کەس نین .

٣ــ بەرچاوترین و بنجیترین سروشـــت و تایبەتـی باسەکە دیار بخا .

لەم لایەنەوە زاراوەی « راناوی کەسی » سەرەڕای بە سەهـو بردن ، هەر دەڵێی بۆیە هاتوە تایبەتیەکانی ئـەم کۆمەڵە وشـەیە تێبدا و رواڵەتێکی درۆزن لە جێـگەیان دانێ . لە فەرزی زاراوەی « راناوی کەسی » دەستیش بدا ، کە هیچ دەست نادا ، دیسانەوە بە نیسبەت راگەیاندنی سروشـــت و کاری وشـــەکانەوە کەم و زۆر نەپێکاوە ، بە تایبەتی بە نیسبەت « راناوی لـکاو »ەوە کە بەشێکە لە راناوی کەسی و هەر ناتەواوییێك لە عینوانەکە هەبێ بە نیسبەت ئەوەوە دەبێتە ناتەواوی لە هەمـــو مەوزوع . با بزانین لە گۆشەی

نیگای راناوی لکاوەوە چۆن زاراوەکە هەر بەجارێ دەست نادا ! .

پێی ناوێ دوبارە کەمەوە لە خۆوە دیارە ، ئەوەی لە زاراوەکەدا بۆ جۆری نەلکاوی دەست نەدا ، بۆ جۆری لکاویشی دەست نادا ، چونکە لکاو و نەلکاو هەر یەك شتن ، ئەمەش «بدیهیە» یەو دەمەتەقە هەڵناگرێ . کەواتە جۆری لکاویشی نە هەمتوی راناوە و نە مەرجە هەمتو جارانیش بۆ کەس بێ . دەمێنێتەوە زاراوەی « لکاو » ئایا ئەو چۆنە ؟

ئەم وشەیەی « لکاو »ە هەر لەوەدا راست دەکا کە لە نوسیندا دەلکێ بە وشەی پێش خۆیەوە ، لەوە بەولاوە ، وەك کڵاوی سەخرەجنی ، هەمتو سروشت و کار و تایبەتییەکی راناوە لکاوەکان دەشارێتەوە . کە لێت بپرسن ئادەمزاد چیە ؟ و بڵێی گیان لەبەرێکە بە پێیان دەڕوا راست ئەوەیە گوتبێتت راناوی لکاو ئەوەیە دەلکێ بە وشەی پێش خۆیەوە . نەختێك ورد بینەوە لێمان مەعلوم دەبێ هەر ئادەمزاد بە پێیان ناڕوا ، چەندین گیان لەبەری تریش وەك ئەو بە پێیان دەڕۆن . گرنگترین رەوشت و سروشتی ئادەمزادیش ئەوە نیە کە بەپێیان دەڕوا ، نەخێر پێیەکانیشی ببڕیتەوە جارێ هەر ئادەمزادە .

راناوی لکاویش تەنها کەرتێکی ئاخاوتن نیە کە دەلکێ بە وشەوە ، چەندین ئەمراز هەیە وەك ئەو دەلکێن و لە نوسیندا دەبنە پارچەی یەك وشە وەك کە دەڵێی « کچی باش ، سێیەم ، هۆشمەند ، فرۆشیار ، بەختەوەر ... » . لکان و نەلکانی وشە لە

نووسیندا دەگەڕێتەوە بۆ جـــۆری دەستوورەکانی ڕێنووس ، لەوانەیە بڕیار بدرێ هەندێك لەو لکاوانە نەلکێنرێن یاخود لکان هەر بەجارێ یاساغ بکرێ . ئاشکرایە زاراوەی « لکاو » وەرگێڕانی « متصل »ی عەرەبییە بۆ سەر کوردیی ، سەیریش لەوەدایە پەیڕەوانی زمانەوانانی ئەورووپا کە دەیانەوێ لە عەرەبی دوور کەونەوە ئەم زاراوەیان هێناوە و دوو جاران تێیدا بە سەهو چوون ، جارێکیان لەوەدا کە نابێ زمانزانی کورد لاسایی زمانێکیتر بکاتەوە لە دانانی ڕێـــزمانی کوردیی ، جارێکیشیان لەوەدا کەوا بە ڕێکەوت ئەم وشەی « لکاو »ە چەندی بلێی مێشك غەلەتێنە لەو « تصوراتە »ی دروســـتی دەکا دەربارەی راناوی لـکاو و هەرچی رەوشت و کردار و تایبەتییێکی هەیـــە دەیخاتە ژێر پەردەوە .

رەنگە وا چاك بێ لێرەدا پێشدەستی بکەم و ئەو کردار و سروشتەی راناوی لکاو باس بکەم بەر لەوەی بچمە سەر دیارخستن و ژماردنی راناو و بەشەکان و جـۆرەکانی . بە درێژایی نووسینەکەشم دەبێ ئەوەت لەبیر بێ کە من جارێ هەر راناوی لـکاو بەکار دێنم ، نە بە زاراوەی راناو و نە بە هی لـکاو رازیم ، وتووێژ دەربارەی دۆزینەوەی زاراوەییێکی راست و دروســت بۆ ئەم تاقمە وشـــەیە کارێکی لێرە بەدواوەیە ، کارێکی ئاسانیش نیە با جارێ خـــۆم و خوێنەری پێوە خەریك نەکەم .

راناوی لـکاو سەرەڕای ئەوەی کە پێکهێنەری رستەی تەواوی خاوەن « حکم و اسناد »ە لە کوردیدا تایبەتییـــکی سەربەخـــۆی

ئەرتۆشی هەیە کەم و زۆر لە تیرە و هـــۆزی « ناو ، ئاوەڵناو »
تەنانەت راناوی نەلکاویش دەرنا کەوێ ، بە کورتی تایبەتی ئەوتۆیـە
لە خودی راناوە نەلکاوەدا هەیە و هیچی‌تر : بە وردی سرنج بگری
دەبینی چالاکییێك لەو راناوانەدا هەیە لە دەستەی کۆمەڵەی ناو و
نەلکاو و ئاوەڵناو و ئاوەڵـکاریان دەردەبـا و دەیانگەیەنێ بـــەو
پایەیە کە دەبوا فیعل نەبێ نەیگاتێ ، لەو روەوە کە « فعـل » بۆ
خۆی رووداوە و چالاکییێکی روتە . با مەبەستت بۆ رون کەمەوە بە
میسـال :

دەڵێی : تێ‌فکریم ، تێوەڕامام ، لێ‌دوام .

ئەمراز ( یاخود پێشگر )ەکانی وەك « تێ ، تێوە ، لێ »
هاتنە پێش «فعل» ەکان و لەگەڵیاندا بە کار هاتن . ئەم پێشگرانە وەك
خۆیان دەمێننەوە کە فیعلەکان دەبنە چاوگ « مصدر » چونکە چاوگیش
وەك فیعل روودانی تێدایە و دەگوترێ : تێ‌فکرین ، تێوەڕامان ،
لێ‌دوان . ئینجا با بەرکار « مفعول » یێك بێنینەوە و بیخەینە رستەوە
لەگەڵ ئەو فیعلانە . دەڵێی : لە دارا فـکریم ، لە تۆوە رامام ، لە
برزۆ دوام . دیتت پێشگرەکان کە کۆبتونەوە لەگەڵ « ناو ، راناوی
نەلـکاو » گۆڕان و بتونە « لە » .

ئینجا با راناوی لـکاو بێنین لەگەڵ فیعلەکان ، دەڵێین :
تێیان فـکریم ، تێوەم رامان ، لێت دوام .

دیتت پێشگرەکان کە دەکەونە پێش راناوی لـکاوەوە وەك ئەوەن

کە کەوتبنە پێش فیعلەوە ، واتە راناوە لکاوەکان رەفتـاری فیعل دەکەن نەك ناو و راناوی نەلکاو . لەو میسالانەدا راناوە نەلکاوەکان هەوتیان لە جێگەی « مفعول » بەکار هاتن ، بەلآم وەك فاعیلیش بەکار بێن فەرقێك ناکەن لە رەفتاریان کە رەفتاری فیعلە ، دەلێی :

لێم دان ، تێمان گرتن ، تێت راخوڕین .

چەند میسالێکی تر لەگەڵ بەکارهێنانی ئەمرازی « بە » دێنینەوە . دەلێی : پێ‌هەڵگەڕا ، پێ‌کرا ، قسەکەی پێ‌گوت . لە چاوگیشدا هەر دەگوترێ پێ‌هەڵگەڕان ، پێ‌کردن ، پێ‌گوتن .

ئەم ئەمرازەش کە لەگەڵ ناو و هاوڕێکانی هات ئەوە نامێنێ کە لەگەڵ فیعل و چاوك بێ . دەگوترێ :

بە شاخەکە هەڵگەڕا ، چراکە بە ئاگر کرا ، قسەکەی بە دارا گوت .

بەلآم لەگەڵ راناوی لکاودا ئەو رەفتارە دەکا کە لەگەڵ فیعلدا کردی :

پێی‌هەڵگەڕام ، پێتان‌کرد ، هەرچی هەبێ پێم‌گوت .

ئەمە رەفتارێکە لە راناوی لکاو بەولاوە هـەرچی بەشی ئاخاوتن هەیە نایکا ، بۆشی ناکرێ ، هەر هەمان چالاکی و بزۆزی و کاریگەرییـە وا دەکا راناوی لکاو ئەو جێ‌گۆڕکێیە بکا کە لەم میسالانەدا دەردەکەوێ :

دەڵێی « دەمگوت » . کە نەفیت کرد ددلێی « نەمدەگوت » .

ئینجا پێشگر یا ئەمرازێـکی بخە پێش و بڵێ « پێم‌ئەدەگوت » . دەبینی راناوە لـکاوەکەی « م » هێندە ئامادەیە بۆ کارتێـکردن ، کام کەرت لە پێشی فیعـــلەکەوە بێ دەرلەحزە پێوەی دەلـکێ و کاری خـــۆی لێ دەکا ، راناوەستی لەسەر هاتنی کەرتێکی‌تر .

جارێـکی‌تریش لەوە بفـکرە کە لە کوردیدا « مضاف الیە » بە هۆی « ی » پەیوەندێ یا « اضافی » بە دەوری خۆی هەڵدەستی . دەڵێی « ســـەری شاخەکە بەرزە ، ناوی تۆ دارایە ، خانوی فلانەکەس دوورە . . . » . بەڵام کە راناوی لـکاو بێ بە « مضاف الیە » هـەر بۆخۆی دەبێتە پێك هێنەری « ترکیب اضافی » بێ ئەوە پێویست هەبێ « ی »ی پەیوەندێ بێتە ناو رستەوە . دەڵێی : براتان رۆیشت ، خانوەکەمان فرۆشرا ، چاوت شینە ، رێیان دوورە .

بگەرێی بەدوا میســـالاندا لە زمانەکەت ، گەلێك جـــۆری بەکارهێنانی راناوی لـکاو دەدۆزیەوە ئەم تایبەتیەی زێدە چالاکێ و بزۆزێ و کارکردنەی تێـدا دیار کەوێ . من بۆ خۆم لەو زمانانەی شتێـکیان لێ دەزانم یەکێـکم نەدیت راناوی لـکاوی یاخود بەشێـکی‌تر لە بەشـــەکانی ئاخاوتنی ئەو کردارە بکا کە راناوی لـکاو لە زمانی کوردیدا دەیکا .

بە راستی راناوی لـکاو داینەمۆی زمانی کوردییە ، بە تایبەتی لە لەهجەی کوردستانی خوارووَدا ، حەیفە زمانزان هـــەر بەقەدەر ئاوەڵناو و پیتی پەیوەندێ و ئیشارە و پرسیار بایەخی پێ بدا یاخود لەســەری زمانیەوە بیکا بە سێبەری ناو . باوەڕم هەیە هەر کەسێك

به رۆنی و ئاشکرایی و قوڵی له راناوی لکاوی کوردی نه‌گا ، له کۆنهی زمانی کوردی ناگا . لێره به‌دواوه ده‌بینی زوربه‌ی که‌سه‌کان راناوی لکاوی جۆرجۆریان هه‌یه ، هـــه‌ر یه‌که‌یان کارێك ده‌بینن و به فه‌رمانێك هه‌ڵده‌ســتن له « ماضی » یه‌وه بۆ « مضـارع » و له تێپه‌ڕه‌وه بۆ تێنه‌په‌ڕ و له رسته‌ی بێ فیعله‌وه بۆ رسته‌ی فیعلدار . ئه‌وه‌نده‌ی فیعل له « تصریف » دا شکڵی ده‌گۆڕێ و کات گۆڕتی ده‌کا راناوی لکاویش له لەهجه‌ی کوردی خواروودا شکڵ و کرداری خۆی ده‌گۆڕێ ، جێگۆڕکێش ده‌کا .

ئه‌وه‌نده‌ی بۆم باس‌کردی له زێـده چالاکی راناوی لکاو و پێك‌هاتنی رسته‌ی ته‌واو و به « اسناد » به‌هۆی ئه‌وه‌وه به‌ســه بۆ ده‌رخســتنی گرنـگی رۆڵی ئه‌م به‌شه‌ی ئاخافتنه له زمانی کوردیدا . هــه‌ر له رێی ئه‌م گرنـگییه‌ی رۆڵیـه‌وه ده‌ریش ده‌که‌وێ راناو هه‌ڵناگرێ ناو و عینوانێکی زیهن غه‌له‌تێنی بۆ دانرێ که تایبه‌تیه‌کانی بشارێته‌وه یاخود بیکا به خزمه‌تـکاری به‌شێـکی تری زمان که « ناو » ه . سه‌یره وشه‌ی وه‌ك « ئه‌دی ، ئه‌رێ ، په‌کو ، ده‌ك ، وه‌ی . . . » ناونیشانی سه‌ربه‌خۆیان هه‌بێ ، به‌ڵام داینه‌مۆی زمانه‌که ناونیشانێکی هه‌بێ وه‌ك خوازرایه‌وه وابێ .

من ، جارێ ، پێش‌نیارێـکم نیه بۆ گۆڕینی زاراوه‌ی « راناو » . وا به چاك ده‌زانم ئه‌رکی دۆزینـه‌وه‌ی زاراوه‌یێکی لێ‌هاتو بۆ ئه‌م به‌شه‌ی ئاخافتن بخرێته سـه‌رشانی ده‌سته‌یێك له زمانزانان ، یاخود کۆڕی زانیاری کورد به به‌رخۆی هه‌ڵبژێ . به‌ڵام به‌نیسبه‌ت زاراوه‌ی

« لـکاو »ەوە ئەو هەمو خۆگرتنـەو قایمەکارییە بە پێویست نازانم . دەست نەدانی زاراوەی « لکاو » کەپشتۆتە رادەی تاوانبارتی ، لەوە تێپەڕیوە کە هەر ناقۆڵاو نالەبار بێ . بەلای منەوە « نەلکاو و لـکاو » هەردویان دوشمنی رێزمانی کوردین ، لەناوبردنیان نەك مافی هەموومانە و بەس ، فەرمانێکی دڵسۆزتی و پەرۆشە بۆ زمانەکەمان وا بەسەر شانمانەوە . من لە رێی سروشت و رەفتاری جۆری « لکاو »ەوە بۆ ئەوە دەچم زاراوەی « چـالاك »ی بۆ بەکار بێ ، خۆ ئەگەر وشەیێیکی بەهێزتر و بزۆزترمان بەدەستکەوێ باشتریشە ، چونکە لـکاوەکان بۆ چالاکی و بزۆزتی وشـەی نمونەیین . هەر لە رێی « چالاك »یشـەوە فـکرم بۆ وشـەی « مەند » دەڕوا کە بکرێ بە زاراوە بۆ « نەلـکاو » .

لە پاشماوەی گوتارەکەمدا دو زاراوەی « مەند و چالاك » بەکار دێنم لە جیاتی « نەلـکاو و لـکاو » و دەڵێم « راناوی مەند و راناوی چالاك » .

ئەو وشـانەی لە لەهجەکانی کوردیدا بۆ راناوی مەند دێنە بەرگوێ ، ناڵێم دێنە بەرچاو چونکی زۆریان لە نوسیندا بەکارنایێن تا چاو بیانبینێ ، بە درێژتی لە کۆبونەوەیێکی لیژنەی رێزمانی سەر بە کۆڕی زانیاری کوردەوە لێیـان کۆڵرایەوە و بە « استقراء »ی تایبەتی ئەندامانی لیژنە کۆکرانەوە و ئەم لیستەیان لێ پێکهات :

أ ـ بۆ کەسی یەکەم :

١ـ تاك : من ، ئەز ، ئەمن ، م .

٢ـ کۆ : ئێمە ، ئەمە ، ئەم ، مە .

ب ـ بۆ کەسی دوەم :

١ـ تاك : تۆ ، ئەتۆ ، ئەتو ، تو ، تە .

٢ـ کۆ : ئێوە ، ئەنگۆ ، ئەوە ، هەوە ، هوین ، هنك ، وە .

ج ـ بۆ کەسی سێیەم :

١ـ تاك : ئەو ، ئەوێ ، وێ ، وی ، ئەوی .

٢ـ کۆ : ئەوان ، وان ، ئانا ، ئەو ، وا .

دەزانم بەشێکی وشەکانی ئەم لیستەیە بەرگوێی خوێنەری کورد نەکەوتوە ، واتە هەمو کوردێك هەمو وشەکانی نەبیستوە ، بەڵام گومانم نیە وشەی تریش هەن کە بەرگوێی ئەندامانی لیژنەی رێزمان نەکەوتون یا بە بیریاندا نەهاتون . لێرەدا نە مەبەستمە ، نە رێشم هەیە رەسەنی و بیژۆکی هەریەك لەم وشانە ساغ کەمەوە ، لێستەکە وەك خۆی دەهێڵمەوە بۆ سرنج و تێفکرین ، سەریش لە کەس ناشێوێنێ لە نوسیندا هەروەك لە خۆشی نەشێواندوە : رچەی خامەی نوسەران بەر پێی هەندێك لەو وشانەی وا هەموار کردوە کە هەر ئەوان بێنە سەر کاغەز و بگەنە بەرچاوی خەلق .

ئەمانە کە سەرجوملەی وشەکانی « راناوی مەند » ن لە شکڵی « چالاك » دا لیستەیێکی تر دروست دەکەن ، بەڵام وەك بۆت دەردەکەوێ ئەمیان وەك هی « مەند » بێ دەمەتەقە نیە . ئەوەی

راستی بێ خەریك بوون بە گەیشتنی كۆتایی دەمەتەقەكە تا ئەو رادەی ئیسپاتێكی بێگومان بەرهەم بێنێ و گۆشـەی نیگای خاوەنەكەی بسەپێنێ بە بەڵگەی رێزمانی و « منطقی » و مێژوویی ، مەیدانێكی گەلێك بەر فرەوانتری دەوێ لەم گوتارە . چارم ناچارە دەبێ خۆم لە زۆر تەفسیلات و وردەكاری و نهێنبینی بدزمەوە تا نوسینەكەم لە قەوارەی گوتاردا جێی ببێتـەوە : زەڕزەبینی و قوڵ بوونەوەی ئەوپەڕەكی دوابخرێ بۆ توێژینەوەی لەسەرەخۆتر و بەر فرەوانتر .

بەڵام وا بـە باش دەزانم بەرلەوەی یەخـەگیری « راناوی چـالاك » بین چەند قسەیێك هەیە لەگەڵ ئەو بەشـەی پێی گوترا « راناوی خۆیی » یەك لای بكەین و جێـگەی راست و دروست بۆ ئەم « راناو »ە دەستنیشان بكەین . لە پێشەوەش بەڵێنم دا كە دواتر سـەرێـكی لێ خوار بكەینەوە ، با ئێرە جێـگەی پێكهێنـانی بەڵێنەكە بێ .

سەرجوملەی وشەی ئەو « راناوە » بەقەدەر ژمارەی « راناوی چالاك » دەبێ كە بۆ « اضافة » بەكار بێ . راناوەكان ، بەو پێیە ، ئەمانەن :

كەسی یەكەم : خـۆم ، خۆمان ؛

كەسی دووەم : خۆت ، خۆتان ؛

كەسی سێیەم : خۆی ، خۆیان .

لە هەندێ لەهجەی كوردیدا لە جێگەی « خۆمان » تەركیبی

« خۆن » بەکار دێ ، لە جێگەی خۆتان « خۆو » . من ناچمە ناو درێژەی جیاوازیی لەهجەکانی کوردیی چونکە بە پێویستی نازانم و بابەتی باس لێکردنیش نیە . هەر دەمەتەقەیێك هەبێ لەگەڵ ئەم کۆمەڵەی سەرەوەدا دەیکەم .

ئەم وشانە ، زیاد لە پێنج بەشەکەی تری لیستەی راناوان وەك راناوی « هەیی و پرسیاریی و ئیشاریی ... هتاد » هەڵدەگرن لە رستەدا شوێنی وشەکانی « راناوی مەند » بگرنەوە ، دەگوترێ « من خۆم هاتم ، ئێمە خۆمان هاتین ، ئێوە خۆتان هاتن ، تۆ خۆت هاتی » ، دەشتوانی راناوە مەندەکان نەڵێی و رستەکەش وەك هەیە وا بمێنێتەوە و بڵێی : « خۆم هاتم ، خۆمان هاتین ، خۆتان هاتن » . ئەم روالەتە زیهن بۆ ئەوە دەبا کە وشەکان وەك بەشی « مەند » ئەوانیش راناو بن چونکە لە رستەدا جێگەی ئەو بەشەیان بەتەواوی گرتۆتەوە و راناوی « چالاك » دەبێتە تەواوکەریان .

بەڵام نەختێك وردبونەوەی زمانزانانە راستییێکی تر دەردەخا و جێگە و ناونیشانی راستەقینە بۆ ئەم کۆمەڵە وشەیە دەست نیشان دەکا .

دەزانین ئەم وشانە پێكهاتون لە ایزافەی « خۆ » بۆ راناوەکانی چالاك . بێگومان تا کە وشەی « خۆ »ش لە فەرهەنگدا واتایێکی بۆ دیار دەکرێ و کراوە چونکە وەك هەمو وشەیێکی فەرهەنگی لە ئاخاوتندا بەکار دێ و دەگوترێ : خۆماڵی ، خۆیی ، خۆییاتی ، خۆ هەڵدانەوە ، خۆرەپێش کردن ، خۆکرد ... هتاد هەر بەو پێیە

خۆم ، خۆمان ، خۆتان ، خۆت ، خۆی ، خۆیان بێ زیاد و کەم تەرکیبێکی ایزافییە وەك هەر تەرکیبێکیتر لە زمانی کوردیدا لەگەڵ تێبینی ئەوە کە واتای « خۆ » تەرکیبە ایزافیەکە ئامادە دەکا بۆ ئەو بەکارهێنانە کە واتاکە لێی دەوەشێتەوە . بە میسال دەڵێم لە کوردیدا ناگوترێ منم دیت ، ئێمەم دیت ، ئێمەمان دیت ، تۆت دیت ، ئێوەت دیت ، ئێوەتان دیت . کەچی دەگوترێ خۆم دێت ، خۆمانم دیت ، خۆمانمان دیت ، خۆت دیت ، خۆتانت دیت ، خۆتانتان دیت . کە ئەمە وایە هەڵبەت ئیسپاتی هێندێی نەکرد « من ، ئێمە ، تۆ ، ئێوە ، ئەوان » راناو نین بەڵکو بە پێچەوانە ، ئەوەی راگەیاند کە ئەم راناوانە بۆ دەربڕینی واتای جۆرجۆر پێویستییان هەیە بە وشەی جۆرجۆر کە واتاکان بەدەستەوە بدەن . تۆ سەیرکە دەتوانی بڵێی « دەستم گوشی » بەڵام وا خۆشە بڵێی « دەستی خۆم بڕی » هەرچەند لە رووی رێزمانەوە چ مانیعێك لەوەدا نییە کە بڵێی « دەستمم بڕی » . تۆ دەتوانی بڵێی « ئەوی دیت ، ئەوانی دیت » بەڵام ئەوسا کەسێکی سێیەمیتری دیوە نەك « خۆی و خۆیان » . ئەمانە پێداویستی « تعبیر » دەیانهێنێ بۆ ناو ئاخاوتن نە سیفەتی راناوی لە « من و تۆ و ئەو » دەسەنێتەوە نە ئەم سیفەتەش بۆ وشەی « خۆ » دەسەپێنێ ، کە ورد بیەوە دەبینی میسالەکان « خۆ » دەکەنەوە بە وشەیێکی فەرهەنگی خاوەن واتایێکی تایبەتی .

« خۆ » دەوەستێتە بەرامبەر « نفس ، عین ، Self » لە رووی واتاوە ، وا دەبێ جێگەی لە رستەدا هەر ئەو واتایانە دەبەخشێ

واش دەبێ جێگەی « تأکید » دەگرێتەوە . دەڵێی « خۆکوشتن » کە واتاکەی « قتل الذات »ە دەشڵێی « من خۆم هاتم » کە دەبێتـە « جئت بنفسی ، بذاتی » بۆ تەئکیدە . لە ئینگلیزیشدا دەگوتـرێ « Self sacrification » کە واتاکەی خۆبەختکردنە دەشـگوترێ « I myself » کە راسـتەوخۆ « من خـۆم » رادەگەیەنێ کە تەئکیدێکی رۆتە .

هەر ئەو راگەیاندنەی واتای « تأکید »ە رێ دەدا بگوترێ « خۆم هاتم » و راناوی چالاك « م » بێتـە تەواوکەری رستـەکە بە دوا وشەی « خۆ » دا . دیققەت بگرە دەتوانی بڵێی «هەمۆمان‌هاتین» کە لەویشدا راناوی چالاکی « ین » بە دوا وشەی « هەمۆ » دا هاتوە . کە دەڵێی « خۆمان هاتین » وشەی « خۆ » سەر لەبەری « ئێمە » دەگرێتەوە ، هەروەها کە دەشڵێی « هەمۆمان هاتین » وشـەی « هەمۆ » دیسانەوە سـەرلەبەری « ئێمە » دەگرێتەوە ، لە هەردۆ حاڵیشدا ، سەرەڕای گرتنەوەی سەرلەبەری واتای ئێمە ، تەئکیدیش هەیە . بۆیەیە دەشێ راناوی چالاکی « ئێمە » کە وا لەم رستانەدا « ین »ە بە دوا « هەمۆ ، خـۆ »دا بێت . تۆ سەیرکە کە لە رستەدا وشەی « نیـوەمان ، هەندێکمان ... » کەوتـە جێـگەی « هەمۆمان » ئەوسا بە دۆ جۆر دەتوانی رستەکە تەواوکەی :

نیوەمان هاتین .

نیوەمان هات .

لێرەدا واتای « ئێمە » هەیە بەڵام نەك سەر لەبەری « ئێمە » ، دەتوانی وشەی « نیوە » بکەیتە « بدل ناقص »ی راناوی ( ئێمە ) و راناوە چالاکەکەی ( ین )ی بــدەیتێ و ( بڵێی نیوەمان هاتـین ) دەشتوانی وشەی ( نیـوە ) بەکار بێنی وەك کەسی سێیەم ، چاکتریش ئەوەیە بە گوێرەی رواڵەتی وشەکە کە رواڵەتێکی ( تاکە ) فیعلی تاکی بۆ بێنیەوە و بڵێی ( نیوەمان هات نەك نیوەمان هاتین ) چونکە وشــەی ( نیوە ) لە رســتەکەدا خــۆی لە واتـای ( ئێمـە ) و کۆبوونەکەی ترازاند وا پەسندترە بەجارێك لێی بترازێ ، واتە هەم لە رووی کەسی یەکەمەوە و هەم لە رووی کۆ ( جمع )ەوە .

لە بیرت نەچێ هەرگیز بۆت ناکرێ بڵێی « هەمـوومان هات » چونـکە واتای هەموو سەر لەبەری ئێمە دەگرێتەوە و دەبێ وەك ئەو کار بکا .

دیتت سروشتی « هەموو » هەڵی گرت ببێتە « نیوە ، هەندێك ، کەمێك . . . » بەڵام سروشتی « خۆ » ئەم کەرت کردنە هـەڵناگرێ کە ئەمە چ دەخلێکی نیە بەسەر رێزمانەوە .

بۆیەیە زمانزان نابێ خۆی تەسلیم بە رواڵەتی وشە و پێداویستی سروشت و واتای بکا لە رستەدا . چ سووچی زمان نیەکە ناگوترێ « هەمووم هاتم » چونـکە واقیع ئەمەیە کەسی تاك نیوە و سێیەکی نیە تاکوو وشــەی « هەموو » بێ و دەفعی شوبهەی هاتنی نیوە و سێیەکی بکا . وشـەی « هەموو » هەر هەمان وشەیە کە دەدرێتە پاڵ « ئێمە » و دەگوترێ « هەموومان » و کە ناشدرێتە پاڵ « من و تۆ » و

ناگوترێ « هەمتوم هاتم ، هەمتوت هاتی » . وشەی « خۆ »ش هەر هەمان وشەی فەرهەنگییە لە تەرکیبی « خۆکوشتن » و « خۆیان هاتن ، خۆمان هاتین »دا . تۆ سەیر کە وشەکانی « خۆ ، هەمتو ، هەندێك » راناوی چالاکیان بە دوادا نایێ ئەگەر ئیزافەی راناو نەکرابن ، بەتایبەتی بەنیسبەت « خۆ »وە . تۆ هەرگیز ناتوانی بڵێی « خۆ هات ، خۆ هاتم ، خۆ هاتین » تەنانەت ئەگەر راناوی مەندیش لە پێشەوە بێ هەر ناگوترێ « من خۆ هاتم ، ئێمە خۆ هاتین ، ئێوە خۆ هاتن » . بەنیسبەت « هەمو »وە کە دەگوترێ « هەمتو هاتین » ئەوەی راستی بێ راناوەکەی قرتاوە دەنا ئەسلی رستەکە « هەمتومان هاتین »بوە . هەڵبەت تایبەتیێك لە وشەی « هەمتو »دا وای کردوە رێ بدرێ بە قرتانی راناوەکە ، تایبەتیێکی وشەی « خۆ »ش وای کردوە رێ نەدرێ بە قرتانی راناوەکە ، بەڵام ئێرە جێی ئەم درێژە پێدانەی تێدا نابێتەوە با وازی لێبینین .

خولاسە وشەی « خۆ » واتایێکی فەرهەنگی هەیە و لە سنوری ئەو واتایەدا بەکار دێت ، ئیزافەی بۆ راناوەکانی «چالاك» وا دەکا لە تەواوکردنی واتای رستەدا راناوی چالاکی بە دوادا بێت و بگوترێ « خۆم هاتم ، خۆم سەرکردەم » دەنا کە ئەو ئیزافەیەی نەبێ وەك وشەیێکی عادەتی لێ بەسەردێ بێ زیاد و کەم وەك بڵێی « خۆ هەڵدانەوە باش نیە » کە ئەمە لەلایەن دەستوری رێزمانی و واتای فەرهەنگییەوە چ فەرقێکی نیە لەگەڵ ئەوەدا کە بڵێی « دەست هەڵبزین پێویستە لەکاتی دەنگ وەرگرتندا » . سەیرێکی ئەم رستە

نموونەییانە بکە :

کابرا خۆیی دەرچوو ، کابرا کۆیی دەرچوو .

بەرخەکە خۆماڵییە ، بەرخەکە ئاوەکییە .

خۆی بۆ بە فێرکار ، برای بۆ بە فێرکار .

چەندی ئارەزوو بکەین دەتوانین رستە بێنینەوە و وشـەی « خۆ » تێیاندا وەك هەر وشـەیێکی تری فەرهەنگی کوردیی بەکار هاتبێ و ئەو واتایەی بە دەستەوە دابێ کە بەپێی جێگەی لە رستەدا و لە گوێرەی سروشت و تایبەتی خۆی لێی چاوەڕوان دەکرێ .

ئینجا با بێینە سەر و کاری راناوی « چالاك » .

قسەی من لێرەدا بە زۆریی لەگەڵ لەهجەی کوردیی ناوچەی کوردستانی ژێرووە ، ئەو لەهجەیە بوە بە ئەمرازی نووسین و کەرستەی تەعبیری ئەدەبی و بڵاو کردنەوەی کتێب و رۆژنامە و گوتار و نامیلکە دەورەدان لە هەموو لەهجەکانی کوردیی کات و ماوەییێکی زۆری دەوێ ، خۆم و خوێنەریش لە ئەرك و پێوە خەریك بوونی دەبەخشم .

جارێ با لە پێشەوە ئەو راناوە چالاکانە بخەمە سەر کاغەز کە بەلای هەموو زمانزانەکانەوە راناوی چالاکن ، لەگەڵ تێبینی ئەوەدا کە هەر من پێیان دەڵێم ( چالاك ) ، لەلایەن زوربەی نوسەرانەوە ( راناوی لکاو )یان بـۆ بەکار دێ ، ناشزانم ئاخـۆ لە دوارۆژدا شتێکی تریان پێ دەڵێن یاخود پێی دادەگرن لەسەر هەمان ناونیشانی

( راناوی لکاو ) بۆیان .

جۆری چالاکی راناوی ( من ) له هەمۆ حالاندا هەر پیتی (م)ە ، پێی ناوێ میسالی بۆ بێنمەوە چونکه « استثناء » له دەستورەکەدا نیە و چ شکلێکی تر پەیدا نابێ بۆ ئەم راناوە .

راناوی چالاکی ( ئێمه ) دوَ جۆری هەیە ( مان ، ین ) .

کەسی دوەمی تاك ( ت ، ی ) جۆرەکانی چالاکیەتی ، بەلام بەلای تاقمێك له زمانزانانەوە له جیاتی ( ی ) ( یت ) راناوە و دەڵێن دەبێ ئەو ( تێ )یە بە دوا ( یێ )یەکەدا هەر بێت و نەقرتێ وەك ( تۆ بەر له من هاتیت ، دوای من دەڕۆیت ) . من خۆم لەوانەم هەمیشه دەڵێم و بە زۆری دەنوسم ( تۆ بەر له من هاتی ، دوای من دەڕۆی ) . دواتر قسه لەم باسه یەك لا دەکەین .

بۆ کەسی دوەمی کۆ راناوی چالاك ( تان ، ن )ە .

بۆ کەسی سێیەمی تاك راناوی چالاکی بێ دەمەتەقه هەر (ی)ە که له « ماضی » بە دوا فیعلی تێپەڕدا دێ و دەشبیته « مضاف الیه » وەك ( چی پێی کرا کردی ، خۆی و برای هاتن ) .

بۆ کەسی سێیەمی کۆ ( یان ، ن ) راناوی چالاکن .

بەرلەوە بگوێزمەوە بۆ راناوە چالاکەکانی گوماناوی دەبێ ئەوە بڵێم ئەم راناوانەش له بە کار هێناندا بێگرفت نین ، رۆن کردنەوەی چۆنەتی هاتنیان بۆ ناو رسته داستانێکه سەربەخۆ ،

دەمەوێ لێرەدا بەکورتترین شێوە لێی بیمەوە .

راناوی چالاکی فیعلی تێپەڕی رابردوو ، هی هەمتو کەسەکان ، خۆیان دەبنەوە « مضاف اليه » ، وەك :

کردمان ، برامان .

کردت ، برات .

کردتان ، براتان .

کردی ، برای .

کردیان ، برایان .

میسالم بۆ کەسی یەکەی تاك نەهێنایەوە چونکە لەهیچ حالێکدا ناگۆڕێ .

لە « مضارع »دا بۆ تێپەڕ و تێنەپەڕ راناوە چالاکەکان یەك جۆریان هەیە ، وەك :

دەخۆین ، دەڕۆین .

دەخۆی ، دەڕۆی .

ئێوە دەخۆن ، ئێوە دەڕۆن .

ئەوان دەخۆن ، ئەوان دەڕۆن .

راناوی فیعلی « ماضی » تێنەپەڕیش هەر ئەو راناوەی فیعلی

« مضارع »ه بۆ هەمو کەسەکان :

ڕۆیشتین ، دەڕۆین .

ڕویشتی ، دەڕۆی .

ئێوە ڕۆیشتن ، ئێوە دەڕۆن .

ئەوان ڕۆیشتن ، ئەوان دەڕۆن .

هەر ئەو ڕاناوەی «مضارع» و فیعلی تێنەپەڕیشە کە لە ڕستەی بێ فیعلدا دەبێتە هۆی پەیداکردنی « حکم و اسناد » :

ئێمە کوردین .

تۆ کوردی .

ئێوە کوردن .

ئەوان کوردن .

هەمو زمانزانان لەوەدا یەك باوەڕیان هەیە کە کەسی سێیەمی تاك لە « ماضی » تێنەپەڕدا ڕاناوی نیە ، بۆیەیە ڕاناوێکی مەعلوم کراوی بێ دەمەتەقەی نیە ، وەك کەسەکانی تر ، ڕستەی تەواوی بێ فیعلی بۆ پێك بێنێ ، هەر ئەم هۆیەیشە وای کردوە زمانزانان ڕێك نەکەون لەسەر یەك باوەڕ دەربارەی ئەمرازی « حکم ، اسناد » لە ڕستەی بێفیعلی وەك ( ئەو کوردە ) ، ئایا ئەم بزوێنەی کۆتایی ڕستە « ە » ڕاناوە یاخود شتێکی ترە ؟ لەجێی خۆیدا قسە لەم باسە دەکەم .

تێکەڵ پێکەڵییێکی یەکجار سەرشێوێن هەیە لە بەکارهێنانی راناوە چالاکەکان لە «صیغە» جۆرجۆرەکانی فیعلی تێپەڕدا، ئەوەندەی سەرم هێناوبرد نەمتوانی شێوازێکی نوسینی ئەوتۆ بەکاربێنم گیروگرفتەکان باوێتە ناو پەراوێزێکەوە لەگەڵ پەراوێزی گوتار خزمایەتی هەبێ، بە ناچاری ئەم باسە زۆر گرنگ و گرێیاویەم واز لێهێنا، کە وام نەکردبا دەبوا پشکێکی گەورەی بارستی گۆڤارەکەم بۆ گوتارەکەی خۆم دابڕیبا کە ئەمەش کارێکی ناڕەوایە. لێرەدا تاکە میسالێك دێنمەوە زەحمەتی تەقەللای یەك لا کردنی گرفتەکان بێنێتە بەرچاو.

شاعیرێکی کورد لە سەرەتای شیعرێکی ئەمەی گوتوە:

«کوشتمت ئاخر بە ناحەق».

هەڵبەت ئەمە گوتەیێکی کوردی رەسەنی بێهەڵەیە و دەشێ بۆ داڕشتنی رستەی‌تر ببێتە نمونە. دەبینی «مفعول» بەدوای «فعل»ی (کوشتن)دا هاتوە کە راناوی چالاکی کەسی یەکەمە، واتە پیتی «م»ە. بەشوێن (مفعول)دا راستەوخۆ «فاعل» هاتوە کە راناوی چالاکی کەسی دوەمی تاکە واتە پیتی «ت»ە. بەو پێیە دەبێ کە بمەوێ کەسی یەکەم بکەم بە فاعیل و کەسی دوەم بکەم بە مەفعول جێگەیان بە یەکتر بگۆڕمەوە و بڵێم (کوشتتم) واتە من تۆم کوشت. کەچی لە هەندێ لەهجەی کوردی رێك و پێکدا دەگوترێ (کوشتمی) کە ئەمە لە هەمان کاتدا واتای (ئەو منی کوشت)یش دەگەیەنێ.

لە پژدەر دەگوترێ (کوشتم) واتە من ئێوە یا ئەوانم کوشت، کەچی لە شـــوێنی تردا بۆ هەمان واتا دەگوترێ (کوشتمن). لە هەندێ ناوچەدا دەڵێن (کوشتیانم یاخود کوشتمیان). وا هەیە دەگوترێ (کوشـتینی) بە واتای ئـەو ئێمـەی کوشـــت، کەچی دەشگوترێ کوشـتمانی.

لە صیغـەی ئاوات « تمنّی » دەتوانی بڵێی (بمکـوشـتبای، بمکوشتبان) واتە من تۆ، ئێوەم بکوشتبا، لە هەمان کاتدا دەشتوانی بڵێی (کوشتبامی، کوشتبامن). رستەی (کوشتبامی) ئەو واتایەش دەبەخشێ (ئەو منی کوشتبا).

تا بەدوای میســالان بکەوین بابەتی تازە بە تازەی گیروگرفت دێتە بەرچاو. هۆی ئەم تێك ئاڵقـان و تێكئاڵۆزانە بەلای منــەوە شتێکی نهێنی نیە، بەلام باس لێکردن و هەڵوەشاندنی گرێ پچکەکانی، ســەرەڕای زەحمەت، کاری تاکە کەسێکیش نیە. گریمان من توانیم هەمو جۆری هەلەی بەکارهێنــــانی ئەم راناوانە بدۆزمەوە، جۆرە راستەکانیش دەست نیشــان بکەم، تۆ بڵێی مافی ئەوەم هەبێ داوا لە نوسەران و زمانزانانی کورد بکەم بێنە سەر ئەو رێیە کە من بەراستی دەزانم؟ دەبێ ئەم باسەش واز لێبێنم وەك وازم هێنا لە موناقەشەی پێنج بەش لە حەفت بەشی لیســـتەی راناوەکانـ بە خۆیانـ و « مفردات » یانەوە. وا دەزانم بڕیاری راستی و هەلەیی بەکارهێنـــانی راناوە چـالاکەکانـ مافی کۆڕی زانیـــاری کوردە، یا بۆ ئەو یا لایەنێـکی تری خاوەن دەسەلاتی بەجێ بهێلین.

ئینجا با بێینه سەر باسی ئەو راناوه چالاکانه که دەمەتەقەیان بەسەرەوە هەیه . لەپێشەوە قسە لە راناوەکانی کەسی دوەم دەکەین ئینجا کەسی سێیەم ، هەردوکیشیان هی تاك .

گوتمان لە کاری رابردوی تێپەڕدا « فعل ماض متعد » راناوی کەسی دوەمی تاك پیتی « ت »ە وەك که دەگوترێ ( خواردت ، دیتت ، کێڵات ، بیستت ، دروت ) . بەپێی دەستورێکی گشتی رێزمانیش هەر هەمان راناوە دەبێتەوە ( مضاف الیه — حەزدەکەم زاراوەی «خاوەن» بەکار بێ بۆ مضاف الیه ) ، دەگوترێ ( برات ، خزمت ، بەرگت ، ناوت ، رێت ، کەللەت . . . » ، دەشچێتە پـاش ئەمرازانەوە وەك ( لێت دەپرسم ، پێت دەڵێم ) .

بەڵام راناوی چالاکی کەسی دوەمی تـاك لە کاری رابردوی تێنەپەڕ و کاری « مضارع »ی تێپەڕ و تێنەپەڕ و رسـتەی بێ « فعل »ی تەواو ، ئا لەم سێ حاڵەتەدا دەمەتەقەی لەسەرە . تاقمێك لە زمانزانان دەڵێن راناوەکە دو پیتی ( یت )ە و ناشێ پیتی «ت»ەکە لە رستەدا بقرتێ و دەبێ هەمیشە وەك لەو میسالانەدا دەردەکەوێ ، بەکاربێ :

تۆ رۆیشتیت ــ رابردوی تێنەپەڕ ؛

تـۆ دەڕۆیت ــ « مضارع »ی تێنەپەڕ ؛

تـۆ دەکەیت ــ « مضارع »ی تێپەڕ ؛

تۆ پاکیت ــ رستەی بێکار « فعل »ی تەواو ؛

هەروەها لە صیغەییەکی ( فەرمان ، داواکردن ، أمر ، طلب ) کە یەکێکە لە دوو ( صیغە )ی ( فەرمان ، أمر ) لە کوردیدا دەبێ ئەم راناوە «یت»بێ نەك « ی » :

دەبێ نان بخۆیت ئینجا بخەویت .

صیغەی ( فەرمان ، أمر ) لە جۆرەکەی‌تردا ( بکە ، بخـۆ ، بخەوە )یە بێ زیادکردنی ( یت ) .

بەلای هەندێك لە زمانزانانەوە ، کە منیش لە باوەڕی ئەواندام ، ئەوەی راناوبێ لەو رستانەدا هەر پیتی ( ی )ە ، پیتی ( ت ) کـە بە دوا ییەکەدا دێ زیادەییەکی ( صرفی ، گەردانی )یە دەشـێ بمێنێ و دەشێ لەناو بچێ . وە نیە من لە زەرفییەکدا بم بتوانم بڵێم لە مێژووی کۆنەوە ئەم ( ت )ە هەروا بێبایەخ بوە ، یاخود بزانم لە ئەسـڵدا چۆن و بۆ چ مەبەستێك هاتوە ، بەڵام ئەوەی بە راناویشی دادەنێ لەم لایەنانە بێخەبەرە وەك من ، بەلـگەی بە راناو حیساب کردنی هەر ئەوەندەیە کە بەدوا ییەکەدا دێ و دەشێ « تلفظ » بکرێ .

لە باوەڕی منـــدا راناوی چالاك ، لەبەر زێدە گرنـگی ئەو دەورەی پێی هەڵدەستێ لە ئاخافتندا ، ناشێ هیچ پیتێـکی بقرتێ . لەپێش چاومانە راناوە چـــالاکەکانی ( مان ، تان ، یان ) لە هەمو حاڵێك و لە هەمو ئەو لەهجانەدا کە بەکاریان دێنـن وەك خۆیان دێنەوە و هیچ پیتێکیان لێ‌کەم ناکرێتەوە ، تێیەکەی ( دەکەیت )یش ئەگەر پیتێکی بنجی با دەبوا ئەویش وا با . لەمەش زیاتر دەتوانم

بڵێم : بۆ دەبێ ڕێ هەبێ تێیەکە بقرتێ و بگوترێ (دەکەی) کەچی ڕێی قرتانی (یێیەکە) نەبێ ، خۆ زۆر ئاشکرایشە دەنگی (ی) لە کوردیدا بە ئاسانی لەناو دەچێ ! ئەگەر یێیەکە بنجی نەبا دەبوا ئەو بێتە قوربانی تێیەکە و بگوترێ (دەکەت لە جێگەی دەکەی) هەر هەمان دەنگی (ت) لە ڕابردوی تێپەڕدا بەهۆی ئەوەوە کە ڕاناوە هەرگیز تێچوونی بۆ نیە .

کە بگەڕێینەوە بۆ بوێژانی بابان لە سەدەی نۆزدەمدا دەبینین تێکڕاایان بە زۆری ئەم تێیەیان قرتاندوە . کوردی دەڵێ :

خۆت بۆ ستەمان کەم بتوی بیستت قسەی ئەغیاریش
فیرعەونی زەمان ئامانت گوێ مەگرە لە هامانت

گوتی (کەم بتوی) نەیگوت (کەم بتویت) .

نالی دەڵێ :

تۆ کە حۆری وەرە نێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی
لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەیی سۆزانمدا

گوتی (تۆ کە حوری) نەیگوت (حوریت) . گوتی (چ دەکەی) نەیگوت (چ دەکەیت) .

لزوم نیە نموونە لە شیعری شاعیرانی ناوچەکانی‌تری کوردستان بێنینەوە چونکە بەکارهێنانی ئەم تێیەی دوای یێیەکە زیاتر لە سلێمانی باوە .

بگەڕێینەوە بۆ فارسیش ، کە لەگەڵ کوردیدا خزمایەتی هەیە ،

دەبینین لەوێدا بۆ کەسی دوەمی تاك لە (ی) بەولاوە راناوی چالاك بەکارنایێ ، واتە دەنگی (ت) هەر بەجارێ بزرە لە هەمو ئەو رستانەدا کە « حکم و اسناد » یان تێدایە . تەنهــا بۆ « اضافة » لە فارسیدا (ت) دەبێتە راناوی چالاکی کەسی دوەم .

دەگوترێ :

تو رفتی ، تو گفتی ، تو اورا دیدی .

تو میروی ، تو میگوئی ، تو اورا می بینی .

دستت مریزاد .

هەر دەڵێی فارسی ئەم راناوەی « اضــافة »ی لە کوردی خواستۆتەوە چونکە لە کوردیدا بەکار هێنانی راناوی (ت) بە پێی دەستوری گشتی رێزمان بۆ « اضــافة» و بۆ فیعلی تێپەڕی رابردوو دەبێ و دەگوترێ :

کردت ، بردت ، خواردت ، هێنات

دەستت ، خانوت ، برات ، خانەت

کەچی لە فارسیدا چ دەستوری گشتی نایێتە بەرچاو کە ئەم (ت)ەی هێنابێتە ناو رستەوە ، یا دەبێ بڵێین تایبەتیێکی زمانی فارسییە یا زیهن بۆ ئەوە دەڕوا لە زمانی کوردی خواستبێتەوە .

وەنیە لەوەدا چ زیانێك هەبێ ئەم (ت)ە بە بەشێکی راناوەکە حیساب بکرێ ، هەروەها زیانیش نیە بگوترێ زیادەییێکی « صرفی »یە ، راستی هەر لایێکیان بێ زمانی کوردی زەرەری لێ ناکەوێ بەڵام

لەگەڵ ئەمەشدا دوو تێبینی دێنە بەر هۆشی مرۆڤ :

یەکەم : راستی ، کە سوودێکی تایبەتیشی نەبێ ، چاکترە لە هەڵە ، با هەڵەکەش چ زیانێکی لێ نەکرێ .

دووەم : رەوا نابینم ئەو کەسانەی (ت) ەکە بە بەشێکی راناو دادەنێن داوا بکەن لە خەڵق کە هەمیشە لە نووسیندا تێیەکە بنووسن . سەپاندنی ئەم تێیە بەسەر نووسیندا دوو زەرەری گەورەی تێدایە :

١ــ بەشێکی یەکجار زۆری کەلەپووری ئەدەبیان کە تێیەکەی بەکار نەهێناوە راستەوخۆ مۆری هەڵەی لێ دەدرێ .

٢ــ رێبازێکی گوشاد لە رەوتی ئەدەبیان کوێر دەبێتەوە و ئازادیی تەعبیرمان کەم دەبێتەوە ، بەتایبەتی بەنیسبەت شاعیرەوە کەوا دەبێ کێش و قافیەی شیعری بەند دەبێ بە تێبردنی ئەو تێیە .

سەیری ئەم بەیتەی نالی بکە هەر چەند بۆ کەسی سێیەمیشە :

نالی زمانەکەی تەڕو پاراوی سوسنت
حەیرانی چاوی نەرگسە وەك لالە نادوێ

کە مەجبوورت کردبا بڵێ ( نادوێت ) کۆتێکت دەخستە دەستی و شیعرەکەت لێ یاساغ دەکرد ، ئەوسا یەکێکی‌تریش رێی دەبوو لە لای خۆیەوە مەعنی ئەم نیوە دێڕەش بکا لە هەمان قەسیدەدا :

یا شاهی نەوبەهارە هەڵیداوە هوردوێ

چونکە وشەی ( هوردوێ ) پیتێکی « ك »ی لێ قرتاوە

ئەسڵەکەی ( هۆردوێك ) بوە .

خاوەنانی ئەو باوەڕەی کە دەڵێ «ت»ەکە زیادەیێکی «تصریفی»یە چ ڕێیان کوێر ناکەنەوە ، هێشتنەوە و قرتاندنی تێیەکە دەخەنە بەر زەوق و خواهشتی بێژەر .

کەواتە بەکار هێنانی ڕاناوی چالاکی کەسی دوەمی تاك « ضمیر متصل للمفرد المخاطب » لە لەهجەی کوردستانی خـوارۆدا گردەبـڕ دەبێتە دوَ جۆری لە یەکدی جودا :

جۆري یەکەم بەلای هەمۆ زمانزانەوە تاکە پیتی «ت»ە ئەویش لەمشوێنانەدا بەکار دێ :

١ــ ڕابردوَی تێپەڕ لە هەمۆ کاتەکانی و هەمـــۆ صیغەکانی خەبەریّ و ئینشائیدا .

نمۆنە بۆ صیغەکانی خەبەریّ :

کردت ، کردوَتە ، کردبوت ، دەتکرد .

نمۆنە بۆ صیغەکانی ئینشائی :

کردبات ، کردبێتت ، کردبوبات ، بتکردبا ( بتکردایە لە لەهجەی سلێمانیدا )[١٣] .

---

(١٣) نۆبینی : خوێنـەر بمبوَرێ لەوەدا کە ناتوانم باسی صیغـەی « خبری وانشائی » کارەکان لێرەدا شـەرح بدەم و جیاوازیّ میـانی واتـای « خبري و انشائي » ش ڕوَن کەمەوە .

٢– دەبێتە « مضاف الیه ـ خاوەن » بێ یارمـــەتی « ی »ی ئیزافە ، دەڵێی : ( برات هات ، ناوت دارایە ، دەستەکانت درێژن )

« لێوت کە وەکوو لەعلی بەدەخشانە بە ئاڵی »

٣– وەك فیعل و چاوگ دەکەوێتە دوای ئـــەو ئەمرازانەی سەر بە فیعلن . دەگوترێ « لێتەوە دیارە ، پێت خۆشـــە ، تێتزا دەبینم » کە چاوگەکانی ( لێوە دیار بوون ، پێ‌خۆش‌بوون ، تێ‌ڕادیتن )ە . ئەم ئەمرازانە هەرگیز نایێنـە دوای ناو وە یا ئاوەڵناوی مەنـدەوە . دەگوترێ « لە ئەخۆلەوە دیارە ، بە تۆ خۆشە یاخود تۆ پێت‌خۆشە ، لە تۆ رادەبینم » .

دەشبێتە هاوبەشی ناو و راناوی مەند لە ئەمرازی ( بـۆ )دا ، کە هەرگیز فیعلی بەدوادا نایێ . دەگوترێ ( بۆت بە پەژوشم ، بۆ تۆ بە پەژوشم ، بۆ دارا بە پەرۆشم ) .

٤– لە رسـتەی فیعلیدا دەبێتە « فاعل و مفعول » و بەپێی داوای دەستووری دروست‌کردنی رستەی فیعلی لە کوردیدا جێ‌گۆڕکێ دەکا ، دەگوترێ :

چیت کرد ـ لێرەدا فاعیلە .

دەتبیـــنم ـ لێرەدا مەفعوولە .

نموونەی جێ‌گۆڕکێ :

دەتـــگرت ، نەتدەگرت ، هەڵت‌نەدەگرت ، منـــداڵەکەت هەڵ‌نەدەگرت .

له ئێمەت پرسیبا ، لێت پرسیبایین ، لێیانت پرسیبا ، پرسیبات .

هەڵبەت راناوی چالاکی کەسی دوەمی تاك لەم تایبەتیانەدا هەر خۆی وانیە ، هەرچی راناوی چالاك هەیە وایە .

ئەمە دەربارەی جۆری یەکەمی راناوەکە کە پیتی «ت» بو .

جۆری دوەمی ئەم راناوە چالاکە چ بڵێین تاکە پیتی « ی »ە و چ بڵێین دوَ پیتی « یت »ە ئەویش مەیدانی تایبەتی خۆی هەیە بۆ بەکارهێنان لە ئاخاوتندا :

١ــ لەگەڵ فیعلی رابردوَی تێنەپەڕدا دێ :

تۆ هەڵستای ـ هەڵستایت ، تو نوستی ـ نوستیت ، تو چوی ـ چویت .

٢ــ لەگەڵ فیعلی « مضارع »دا دێ تێپەڕ بێ و تێنەپەڕ بێ : دەکێڵی ، دەکەی ، دەخۆی ، دەنوی ، دەکەوی ، دەمری ، دەبرژێی یاخود دەکێڵیت ، دەخۆیت ، دەکەویت ...

٣ــ لەگەڵ یەکێك لە دوَ صیغەی فەرمان « أمر »دا دێ : بکەی ، بخۆی ، بنوی ، بی ، بدەی ، بڵێی ، بکەوی یاخود بکەیت ، بنویت ، بڵێیت ...

ئەوەی راستی بێ صیغەی فەرمانی راستەقینە هەر ( بکە ، بخۆ ، بنو ، بکەوە )یە نەهی راستەقینەش (مەکە ، مەخۆ ، مەنو ،

مەکەوە)یە ، هەر بۆ کەسی دوەمیش بەکار دێ کە وا لە بنەڕەتا «أمر و نهی» بۆ ئەو داهاتوە . صیغەکەی‌تر بە « مثبت و منفی »یەوە واتە ( بکەی ، بکەن ، بکەم ، بکەین ، بکا ، بکەن ـ هەروەها نەکەی ، نەکەن ، نەکەم ، نەکەین ، نەکا ، نەکەن ) فەرمان و نەهی رەبەق نین ، وادەبێ بۆ « دعاء » یاخود هەڕەشە و مەبەستی تریش بەکار دێن :

خوا نەکا تۆ نەخۆش بی .

خوا بکا ببارێ .

بچێ بۆ فێرگە باشترە لە بازاڕ .

پارەکەم بدەیێ و نەدەیێ دەغلەکەت هەر بۆ دێنم .

(تەماعی گەورەیی بێ چەك نەکەن نەك) .

٤ـ دەبێتە تەواوکەری رستەی بێ فیعل ، واتە لە ریێ ئەوەوە « حکم ، اسناد » لە رستەی بێ‌فیعلدا پەیدا دەبێ ، وەك :

تۆ مرۆڤی ، تۆ مرۆڤیت .

هەمیشە لە پێشەوەی ، لە پێشەوەیت .

دوژمنی کەس نی ، نیت .

لە صیغەی فەرمانی راستەقینەدا ( مەکە ، مەڕۆ ) ئەم راناوە بەدەرنا کەوێ ، لە کەسیشم نەبیستوە گوتبێتی لێرەدا راناو هەیە ، تەنها مامۆستا ( نوری علی أمین ) بەلایەوە لەو فەرمانانەدا کە کۆتاییان زوێنی (ە) یە بزوێنەکە راناوە وەك (بکە ، ببە ، بدە ، بوەستە) ، کەچی

هەرخۆی دەڵێ هەمان بزوێن لە رستەی وەك (دارا کوردە)دا راناو نیە و کاری بون (فعل الکینونە)یە .

ئەوەی راستی بێ بەلای منەوە نەك هـەر راناو وجودی نیە لە فیعلی ئەمری کەسی دوەمی تاکدا ، هۆیەکی زۆر بەهێزیش هەیە بۆ نەبونی راناو هەم لەو فیعلە و هەم لە زوربەی فیعلەکانی کەسی سێیەمی تاکدا . لێرە بەپێشەوە بەڵێنمدا کە ئەگەر مەودای شیکردنەوەی ئەم هۆیە بمێنێ لە گوتارەکەمدا ، بە پێی باوەڕی خۆم شەرحی باسەکە بکەم . بە داخەوە هەرچی دەرفەت و مەودایە بە دەستەوە نەماوە لەبەر زێدە درێژەکێشانی باسەکان ، بۆیێ بە ناچارێ وازی لێدەهێنم .

ئێستا دێینە سـەر باسی ئەو راناوانەی کەسی سێیەمی تاك کەوا دەمەتەقەیان بە دەورەوە هەیە و زمانزانان تێیاندا گوماناوین .

بە راستی هەر لە دوو نوقتەدا زمانزانان رێك دەڕۆن لە باوەڕیان دەربارەی ئەم راناوانەی کەسی سێیەمی تاك : نوقتەی یەکەم ئەوەیە کە فیعلی رابردوی تێنەپەڕ « ماض لازم » بۆ کەسی سێیەمی تـاك راناوی نیە . نوقتەی دوەم ئەوەیە لە فیعلی رابردوی تێپەڕ بۆ کەسی سێیەمی تاکدا ، دەنگی (ی) دەبێتە راناو ، وەك : کـردی ، دیتی ، بردی ، سوتاندی ، هاویشتی ... ئەم راناوەیش چ دەورێکی راناوی چالاك هەیە پێی هەڵدەستێ : دەبێتە « مضاف الیه » و بە دوا ئەمرازەکانی سەر بە فیعلەوە دێ و دەبێتە فاعیل و مەفعـول و جێگۆڕکێ دەکا بەپێی داخوازی دەستورەکانی بەکارهێنـانی راناوی چالاك .

لەوە بەولاوە جیاوازیی بنجی هەیە لە میانی زمانزانان دەربارەی بوون و نەبوونی راناوی چالاك بۆ کەسی سێیەمی تاك .

بەشی زۆری خاوەن رایەکان بۆ ئـەم بیرو باوەڕانەی خوارەوە دەچن :

١- لە فیعلی «مضارع»دا راناوی کەسی سێیەمی تاك هەمیشە هەیە و بریتییە لەو (ت)ەی کۆتایی فیعلەکان کە لە هەنـدێ لەهجەکاندا دەقرتێ وەك : دەچێت ، دەخوات ، دەنوێت ، دەژیت ، دەکات ، دەتوسێت .

هەنـدێ لەم خاوەن رایانە وا دەزانن دەنـگەکەی پێش دەنگی (ت) ئەویش هەر بەشێـکی راناوەکەیە .

٢- لە فیعلی فەرمانـدا « أمر » یشـدا عەینی باوەڕ دووبارە دەکەنەوە و دەڵێن لە فیعلەکانی ( بڕوات ، بنوێت ، بلێت ، بژیت ، بکات ) دەنـگی (ت)ی کۆتایی فیعلەکان راناوە . باوەڕی وەهـاش هەیە دەنگەکەی پێش (ت)ەکەش بە بەشێـکی راناو دادەنێ .

بە راستی راناوی کەسی سێیەمی تاك ئەگەر هەبێ لە فیعلی « مضارع »دا هەر خۆیەتی سەر هەڵدەداتەوە لە فیعلی فەرمانـ « أمر» دا چونـکە صیغەی «مضارع» نیشانەی «مضارعە»کەی دەکرێ بە نیشانەی « أمر » و وەك خۆی دێتەوە ، واتە فیعلی (دەڕوات) نیشانەکەی (دە)ی ائی دەگۆڕێ و دەکرێتە (ب) و فیعلەکە دەبێتە (بڕوات) . صیغەی « أمر »ی راستەقینە هەر ئەوەیە کە بۆ کەسی دوەمی تاك بەکار دێ ، چونـکە فەرقی دیاری هەیە لەگەڵ صیغەی

« مضارع » دا . بەنموونە : لە « مضـــارع » دا دەڵێی (دەخۆی) ، کەچی لـە «أمر» دا دەڵێی (بخۆ)... دەڵێی (دەکەی — بکە ، دەچی — بچۆ ، دەمری - بمرە)

٣— بزوێنی کۆتایی رســـتەی وەك (دارا مەردە) بە راناو دانانێین ، بە لایانەوە (فعل الـکینونه ، Verb to be ، کاری بوون)ە ، تەنانەت هی وا هەیە لە رستەکانی (من مەردم ، تۆ مەردیت ، ئێمە مەردین ، ئێوە مەردن) تەواوکەری رستەکان (م ، یت ، ین ، ن) بە راناو دادەنێ بەڵام بزوێنی (ە) لە رســـتەی (دارا مەردە)دا بە راناو دانانێ و بە فیعلی حیساب دەکا .

بە نیسبەت خاڵی یەکەم و دووەمەوە کە رستەکانی (دەچێت ، دەخوات ، دەژیت ..) لە ئایندەدا و رستەکانی (بچێت ، بخوات ، بژیت) لە فەرماندا دەکا بە نموونەی بوونی راناوی چالاك بۆ کەسی سێیەمی تاك ، چی لێرە بەپێشەوە گوتم دەربارەی (ت)ی کەســی دووەمی تاکەوە کـە بە دوا (ی) رانـاودا دێ ، هـــەمووی دووبارە دەبێتەوە دەربارەی ئەم (ت)ەی کۆتایی فیعلەکان بۆ کەسی سێیەمی تاك . هـــەموو ئەو رەخنەی لەوێ خســـتمە بەرچـاو لێرەش ، ئۆتۆماتیکی ، دێتــەوە . بەڵام بە نیسبەت کەســی سێیەمی تاکەوە رەخنەیێـکی تایبەتی بە زیادەوە هەیە پتر دەبێتە سەپێنەری ئەو رایەی کە دەڵێ (ت)ی فیعلەکانی (دەخۆیت ، دەخوات) واتە هی کەسی دووەم و سێیەمی تاك زیادەی (تصریفی)ن نەك راناو .

کەسی سێیەمی تاك لە « مضارع و أمر » دا نەك هەر دوو صیغەی

(بەتێ و بێتێ)ی هەیە ، صیغەیێکی سێیەمیشی هەیە لە زۆرترین ناوچەکانی کوردستانی خوارۆدا بەکاردێ ، هەروەها لە گەلێك شوێنی کوردستانی سەرۆشدا . سەیری ئەم نموونانە بکە :

١- دەڵێ ، دەڕوا ، دەژی

دەڵێت ، دەڕوات ، دەژیت

دەڵێتن ، دەڕواتن ، دەژیتن

٢- بکا ، بنوێ ، بژی

بکات ، بنوێت ، بژیت

بکاتن ، بنوێتن ، بژیتن

لە هەردوو صیغەی «مضارع و أمر»دا سێ جۆر بەکارهێنان هەیە و تائێستاش زیندوون ، چ دیاریش نیە بمرن . کە ڕێگە هەبێ بگوترێ ئەو (ت)ەی کۆتایی فیملەکان کە دەشێ بقرتێن ئەوان ڕاناون ، بۆ نەگوترێ (تن)ەکە تێکڕای ڕاناوبێ ؟

بێگومان کەسانێك کە خەیاڵیان چوە بۆ ئەوە کە هەر (ت)ەکە ڕاناو بێ ، ئەگەر خۆیان بە زۆری (تن)ەکەیان بەکار هێنابا بێ دوو دڵی دەیانگوت ئەو ڕاناوە ، بەڵام ڕێکەوت وایە لە ئاخاوتنیاندا خۆیان هەمیشە هەر (ت)ەکە بەکار دێنن ، تەنانەت لە هەندێکیانم بیستوە کە ئەم (تن)ە لە ناوچەی سلێمانیدا هەر بە کار نایێ ، ئیتر کە خۆی بەکاری نەهێنێ و لە شارەکەشیدا بەکار نەهاتبێ ، دیارە بە درەنگەوە بایەخی پێ دەدا یا هەر پێی نادا . بەڵام ڕاستییەکەی

ئەمەیە کە ئەم صیغەیە لە سلێمانی و غەیری ئەوێش لە سەرانسەری کوردستاندا بەکار هاتوە و بەکار دێ . لێرەدا بە نمونە شیعری دوَ شاعیری کوردی سەدەی نۆزدەم دەکەین بە شایەدی قسە :

شێخ رەزا لە پێنج خشتەکییێکی بەسەر غەزەلی (مصطفی) بەگی کوردییەوە ئەمەی گوتوە :

بە یادی چاوی مەستی خۆم گوتی مەیخانە (بێتن) جێت

فیعلی ( بێتن )م خستە ناو کەوانەوە تا چاوی خوێنەر باشتری بخوێنێتەوە .

لە لاپەڕە (٩)ی دیوانی ( مەلا وەسمان ) کە خۆی خەلقی سلێمانی بوە ئەم بەیتە دەخوێنیتەوە ، لەپێشەوە بە رێنوسی خاوەنی دیوان ئینجا بە رێنوسی تازەی کوردیی بەیتەکە دەنوسمەوە :

علمە کالای مغفرت پشتانی بالای ادمی
ژنگی عصیان دیرزینی توبە ( دیکاتن ) رفو

ئەمەش بەیتەکەیە بە رێنوسی تازە :

عیلمە کالای مەغفیرەت پشتانی بالای ئادەمی
ژەنگی عیسیان دەیرزێنێ تۆبە ( دەیکاتن ) رفو

دیسان فیعلی ( دەیکاتن ) خرایە ناو کەوانەوە بۆ مەبەسی ئاشکرایی .

بەپێی باوەڕی من ، بوونی ئەم جۆرە « تصریف »ە زیاتر راناو نەبوونی پێتی (ت) ئیسپات دەکا چونکە دیاردەدا کە وا نەك هەر پیتی (ت) بەڵکو دوو پیتی سەرلەبەری (تن) بە زیادەوە دێنە ناو فیعلەوە و هەردوو شیان بەجارێ ، یا هەر جارە یەکێکیان ، دەقرتێن .

ئەو زمانزانانەی پێ دادەگرن لەسەر گوتن و نووسینی دەنگی (ت) لە کۆتایی فیعلەکاندا و دەڵێن دەبێ هەمیشە بگوترێ و بنووسرێ (دێت ، دەخوات ، بکات ، بڵێت) سێ جاران ، هەرجارە بەجۆرێك ، ستەم دەکەن :

جاری یەکەم ستەمیان لەوەدایە کەوا بێ بەڵگە و هۆی « ترجیح » ، تاکە دەنگی (ت) دەسەپێنن بەسەر گوتن و نووسیندا لە حاڵێکدا جووتە دەنگی (ت ، ن) وا لە کاردان و خەڵق دەیانڵێ و دەشیاننووسێ . بێگومان سەپاندنی (ت ، ن) زیاتر لە ئیحتیمالی هەڵە دوورە چونکە ئەگەر دەنگی (ت) راناو بێ ئەوا (ت)ەکە هەیە و نەقرتاوە و دەشێ بگوترێ (ن)ەکە زیادەیێکی « تصریفی »یە خۆ ئەگەر (ت ، ن) بەیەکەوە راناو بوون ، ئەوە نیشان پێکراوە و لە هەڵەی حیساب نەکردنی (ن)ەکەش بە راناو رزگار بووین . لە فەرزی هیچیشیان راناو نەبن فەرقی (ت)ی تەنها و (ت ، ن)ی بەجووتە نیە : هەڵە هەر هەڵەیە .

جاری دوەم ستەمیان لەوەدایە کە بە سەپاندنی (ت) دوو شەقامەڕێی ئاوەدان کوێر دەکەنەوە ، بێ لزوم و بێ بەڵگە و بێ

پاڵ پشتی مەنتیقی و زانستی و مێژوویی .. بێ هیچ .

جاری سێیەم ستەمیان لەگەڵ « اجتهاد »ی خۆیانە ، چونکە کە مەیلیان بۆ ئەوە چوو پیتی قرتاو بە راناو حیساب بکرێ ، بۆ لە نیوەی رێگە دەوەستن و تاکە پیتی (ت) دەکەنە راناو لە حاڵێکدا زمانەکە دوو پیتی بەدەستەوە داوە ؟ .

هەندێـــك لەو زمانزانانە بەڵگەیێك دێننەوە کەمێك دەبێتە داروەکازی دەستی ئەم (ت)ە . دەڵێن لەو فیعلانەی صیغەی « دووبارە کردنەوە »یان هەیە ئەم دەنگەی (ت) دێتەوە و قرتانی بۆ نیە وەك کە بڵێی « دەرگاکە دەکاتەوە ، نەختێکی تر دێتەوە ، دارەکە خەریکە دەژێتەوە ، تازە بەرەو ماڵ دەبێتەوە . . »

ئەم بەڵگەیە زەکا و وردبینی تێدایە ، بەلام مەبەست ناسەپێنێ .

سرنج بگرە دەبینی هەرچی فیعلی کەسی سێیەمی تاك هەیە لە « مضارع »دا بە بزوێن کۆتایی دێ وەك « دەڕوا ، دەچێ ، دێ ، دەژی . . . » ، دەوجا کە ویستت پاشگری « ەوە »ی دووبارە کردنەوەی بخەیتە سەر دەبێ پیتێکی پەیوەندی بێتە ئاڵقەی بەیەکەوە بەستنەوەی کۆتایی فیعلەکە ، کە خۆی بزوێنە ، لەگەڵ پاشگری « ەوە » کە ئەویش بە بزوێن دەست پێدەکا ، مەعلومێکی وەك بەدیهیەش وایە بزوێن ناچێتە سەر بزوێن بێ ئاڵقەی پەیوەندی . کەواتە دەبێ پیتێك بە زیادەوە بێ ئەگەرچ پیت لە بەینـدا نەبوو . لەوەڕا دەردەکەوێ هاتنی « ت » یا پیتێکی تر شتێکی ناچارییە و

نابێته بەلگەی راناو بوون ، تەنانەت رەسەن بوونیشی . بەلاّم ئـەو پرسیارە هەر دەمێنێ لە خۆمانی بکەین : بۆ دەنگی ( ت ) هات و دەنگێکی تر نەهـات ؟ بۆ نەمانگوت « دێخـەوە » لە جیاتی « دێنـەوە » ؟ یاخـود بۆ نەمانگوت « بەرەو ماڵ دەبێشەوە » لەجیاتی « دەبێتەوە » ؟.

بەلای منەوە هـاتنەوەی « ت » لێرەدا لە هـاتنی هـەموو دەنگێکی تری « ئەلف و بێی » کوردیی لەبارتر و مناسبترە ، چونکە خۆی بە ئەسل وەك زیادەیێکی « تصریفی » هـاتنی بۆ نـاو فیعلی « مضارع » شتێکی عادەتییە ، واتە لە فـەرزی ئیسپاتیش بوو کە راناو نیە ئەوەی هەر بۆ دەمێنێتەوە کە زێدە لە دەنگەکانی تر دەشێ بێتە ناو فیعلەوە بە وێنەی « تصریفی » یاخود لەژێر هەر عینوانێك بێ . تۆ کە رێت هـەبێ بلێیی « دێت » با ئەو دەنگەی « ت »ە راناویش نەبێ ، هاتنەوەی خـۆی لە کاتی پێویستیدا گونجاوترە لە هاتنی دەنگێکی تری بێگانەی وەك « ش ، ك ، ل ، م .... » .
لەم رووەوە لە ئاوەڵەکەی خۆیشی کە « ن »ە ئـاشناترە بە فیعلەکە ، چونکە خۆی بە فیعلەوە دەلکێ و دەکەوێتە میانی کۆتایی فیعلەکە و نوونەکەوە ، جگە لەوە کە پیتی [14] ( ت ) یەکێکە لـەو پێنج پیتانەی دەکەونە پێش ( نوونی چاوگ ) و دەبنە کۆتایی فیعـل .

---

(١٤) لەم شوێنانەدا مەبەس « دەنگی پیتەکان »ە ، پیت بۆ خۆی نیشانـەی دەنگە .

کەواتە سەیر نیە دەگوترێ (دەخواتەوە) و ناگوترێ (دەخواتنەوە) یاخود (دەخوانەوە) با ئەو « ت »ە زیادی « صرفی » بێ نەك راناو .

ئەم بۆرە بەلگەی هاتنەوەی « ت » لە « مضارع »ی دوبارە کراوی کەسی سێیەمی تاك ، نابێتە داروەکاز لە هەڵستاندنەوەی باری « ت » لە « مضارع »ی کەسی دوەمی تاکدا چونکە زوربەی ناوچەکانی کوردستان لەوێدا نایهێننەوە ناو فیعل و دەڵێن (دێیەوە ، دەخۆیەوە ، دەکرێیەوە ، دەدۆزیەوە .. » . لێرەدا هۆیێکی یەکجار ورد و نهێنی هەیە ، بە سرنج گرتنێکی دوَر و قوڵ نەبێ لە زمان و بزوَتنەوەی ناوەکی میکانیزمی زمان ، ئیمکان نیە هەستی پێ بکرێ . هۆیەکەش ئەمەیە :

بزوێنەکانی کۆتایی فیعلی « مضارع »ی کەسی سێیەمی تاك هەمیشە بە بزوێنی دەمێننەوە و هیچ کامێکیان ناگۆرێن بە (دەنگدار) ، لەبەر ئەمە هەرگیز ناشێ بزوێنی تری پێوە بلکێ . فیعلەکانی (دەخوا ، دەڵێ ، دەژی ، دەچێ ، دەبا . .) ناکەونە هیچ حاڵێکەوە شکڵی کۆتاییان بگۆرێ بە پیتی دەنگدار . ئەم شکڵەیان « نهائی »یە . بەڵام راناوی « ی »ی کەسی دوەمی تاك وا دەبێ بزوێنە و وا دەبێ دەنگدارە ، واتە ئیمکان هەیە خۆی ببێتە ئەو پیتە کە بزوێنی « ەوە »ی پێوە بلکێ ، ئیتر زەروَرەت نامێنێ ئەو «ت»ەی زیادەی « تصریفی » بکرێ بە ئاڵقەی پەیوەندێ ،

سەیری ئەم نموونانەی خوارەوە بکە :

دەچیـت ، دەژیت ، دەبیت .. لەمانەدا پێیەکە بزوێنە .

دەخۆیت ، دەکەیت ، دەڵێیت .. لەمانەدا پێیەکە دەنگدارە .

دەوجا کە حاڵ وابێ رێ هەیە بگوترێ (دێیەوە ، دەکەیەوە ، دەچیەوە ، دەژیەوە ، دەڵێیەوە) . کە زەروورەتیش نەما بۆ هاتنی «ت» هەڵبەت خەلق ئازاد دەبێ لەوەدا کە وەك زیادەی « تصریفی » بی‌هێنێتەوە یا بی‌قرتێنێ ، بەوەدا جارێکی‌تریش راناو نەبوونی ئـەم « ت »ە بەرەو ئیسپات دەچێ(۱۵) .

دیسانەوە بانگ هێشتنت دەکەم لەگەڵ مـــندا ، بە چاوێکی زەڕڕەبین ، سرنج بگریە ئـــەم تایبەتیەی « فعـل أمر » بـۆ کەسی دوەمی تاك .

صیغەی « أمـــر »ی راستەقینەی وەك (بڕۆ ، بکە ، بڵێ ، بژی) هیچ زیادەی « تصریفی » تێـــدا نیە وەك لە صیغەکەی‌تردا هەیە کە دەگوترێ (بڕۆیت ، بکەیت ، بڵێیت ، بژیت) . لەبــەر ئەمە صیغەی « أمر »ی راستەقینە لەو فیعلانەدا کە دوبارە کردنەوەیان

(۱۵) لە گوتاری (بەکار هێنانی « ی » لە رێزمانی کوردی) کە لە یـەکەم ژمارەی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا بلاو کرایەوە ، بەراوردییێکی مەیلەو ورد هەیە دەربارەی ئەو پێیانەی هەمیشە بزوێنن و ئەوانەی لە بزوێنی دەکەون ، خوێندنەوەی ئەویان یارمەتی تێگەیشتنی ئەمیان دەدا .

تێدایە چاوپۆشییان تێدا دەکرێ لە نەهێنانی پیتی ئاڵقەی پەیوەندی بۆ بەینی کۆتایی فیعلەکان ، کە بزوێنن ، لەگەڵ پاشگری « ەوە » ، کە دوبارە کردنەوە رادەگەیەنێ . لەم حاڵەدا زەرورەت وا دەکا بێهێزترین بزوێن لە ناو بچێ کە بزوێنەکەی سەرەتای « ەوە »یە واتە بزوێنی « ە » کە فەتحەی پێ دەگوترێ لە زمانی عەرەبیــدا . بەو پێیــە دەگوترێ ( بخۆوە ، بکەوە ، بڵێوە ) . وابزانم تەنها ناوچەی سلێمانی ، کــە حەز دەکا پیتی پەیوەندی بــەکار بێنێ ، لەم فیعـلانەدا پیتی « ر »ی ناسـك دەهێنێ بـۆ میانی هەردو بزوێنەکان و دەڵـێ ( بخۆرەوە ، بکەرەوە ، بزورەوە . . » . بەلام لەوێشدا کە کۆتایی فیعلەکە «رە» بێ واز لە « ر »ەکەی زیاد دێنن و دەڵێن ( وەرەوە ، بشارەوە .. ) . ئەم حەز لێکردنەی ناوچەی سلێمانی لە پیتی پەیوەندی ، هەر خۆی سەبەبی ئەوەیە هەمیشە کات بڵێن ( دەڵێیتەوە ، دەخــۆیتەوە . . ) جارێــکیان بە رێـکەوتیش پیتی « ت »ەکە نەقرتێنن . وادەبێ زیاتریش مەیـلی خــۆیان بۆ ئارایشتی وشـــەبێ ، کە تایبەتیێکی « حضاری » پێش کەوتوە ، دیارنخەن بـەوەدا کە ســەرەڕای تاکە پیــتی « ر » زیادەییێکی تری درێژی « تصریفی » بخەنە کۆتایی فیعلی « أمر »ەوە و بڵێن « بخۆرەوەوانێ ، بێرەوەوانێ ، بکەرەوەوانێ » . لە رابردو و « مضارع »یشدا ئەم زیادییە هەر بەکار دێنن .

ئەم روونــکردنەوانە دەربارەی حالاتی کەسی دوەمی تاك ، بەر لەوە لە کەسی سێیەمی تاك بدوێم و فیعلی دوبارە کردنەوە باس بکەم ،

جێیان خۆش نەدەبوو بۆیێ لە شوێنی خۆیانم هەڵەنگاوتن بۆ ئێرە .

کەواتە باوەڕی من ئەمەیە لە فیعلەکانی (دەڕوات ، دەچێت ، دەخوات ، دەژیت) کە فیعلی « مضارع »ی کەسی سێیەمی تاکە ، نە پیتی (ت) نە پیتی پێش ئـەو هیـچ کامێکیان راناو نین ، پێداویستی « تصریف »ن . وەك ئەوانیش دوو پیتی (ت ، ن) لە فیعلەکانی (دەڕواتن ، دەخواتن ، بچێتن ، بڕواتن ...) . ئەم زیادییانە ئەگەر راناو بان دەبوا لە شوێنی تردا دەربکەون و بنـەهۆی پەیدابوونی « حکم و اسناد » لە ئاخافتندا ، تۆ سەیریان کە لەو شوێنانەدا کە بەکاریش دێن « حکم و اسناد » دروست ناکەن چونکە بە قرتانیان چ نوقسانییێك پەیدا نابێ ، « حکم و اسناد »ێك لە رستەدا کە هەیە هەر دەمێنێ . ئەوەی راستی بێ رەنگە جۆرێك « تأكید » رابگەیەنن ، بە تایبەتی لە کاری وەك (دەبارێتن)دا ئیشارەییێکیش هـەیە بۆ « مستقبل » ، واتە زیاتر لە بەیانی راستییێکی « مطلق » ، رووداێـکی بەرچاوی چاوەڕوان کراو دەخاتە بەر هەستی مرۆڤەوە .. بەڵام ئەم تێبینییە لێکۆڵینەوەی زیاتری دەوێ .

دەربارەی خاڵی سـێیەم کە بزوێنی کۆتایی رستـەی وەك « دارا مەردە » و زمانزانان بە لاسایی کردنەوەی رۆژئاواییەکان دەڵێن « کاری بوون ، فعل الکینونە ، Verb to be »یە رەخنـەیێك و تێبینییێکی بنجیم هـەیە لەگەڵ هەنـدێك روونکردنەوە کە دەبن بە کۆتایی گوتارەکە .

وەك پێشتر باسم کرد زمانزان هەیە لە نێوان هەمو راناوە چالاکەکاندا تەنها بەم بزوێنە دەڵێ « فعل الکینونە » ، واتە ئەمیان زیاتر لەوانی تر قسەی بەسەردەوە هەیە کە فیعل بێ . دەبا بزانین هیچ ئیمکان هەیە ئەم بزوێنە ، یاخود هاوڕێکانی کە راناوە چالاکەکانن وەك ( م ، مان ، ین ، ت ، ی — یت ، تان ، یان ، ن . . ) فیعل بن ؟ لەو روەوە زۆرتر موناقەشەیێکی بیروباوەڕەکەم کرد لە روانگەی تێکڕای راناوە چالاکەکانەوە ، لێرەدا کەمێك زیاتر لە موناقەشەکە قوڵ دەبینەوە بەنیسبەت ئەو بزوێنەوە چونکە تایبەتیێکی سەربەخۆ لەودا هەیە تا رادەیێك وتووێژ دەربارەی ئەو جودا دەکاتەوە لەوانی تر .

لە رستەی ( دارا مەردە )دا کوا فیعل ؟ دەزانین هەمو فیعلێك لە خودی خۆیدا ، واتە لە ناوەڕۆك و واتای وشەکەیدا ، دوو رەگەزی هەیە کە هەر خۆیان ناوەڕۆك و واتای فیعلەکە پێكدێنن . ئەم دوو رەگەزە (کات و روودان) ن . هەرچی فیعلی جیهان هەیە بیانهێنەوە بە نمونەی دەمەتەقە ، تاکێکیان بێ ئەم دوو رەگەزە نیە و ئیمکانیش نیە هەبێ . کە دەڵێی ( دارا هات ) بێ پێویستی تەئویل و یارمەتیدانی زمانزانانەی من و یەکێکی تر راستەوخۆ راتگەیاند کە روودانی « هاتن » لێرە بەپێشەوە بوە ، ( دارا ) ش لابەری لە رستەدا و بڵێی « هات » ئەم روودانە و کاتی لێرە بەپێشەوە سەر لە بەریان لە

فیعلەکەوە هەڵدەقوڵێن و دەبن بە ناوەرۆکی[١٦] . ڕوودان و کاتەکە لە مێشکی من و تۆ ، یا خود لە ڕاگەیاندنی واقیعێکی دەرەوەی فیعلەکە ، یا لە « مقتضى الحال » و شتی ئەوتۆوە نەهاتوون ، هەر خۆیان فیعلەکەن . کە دەڵێین ( ڕوودان ) مەبەستمان پەیدابوونی شتێکی نەبووە ، واتە لە فیعلی ( هاتم )دا هاتنەکە لە نوێ پەیدابوو و پێشتر وجودی نەبوو .

لەبەرتیشکی ئەم ڕاستییە بەدیهیانەدا با سەیرێکی ( دارا مەردە ) بکەین . با بزانین ، بێ شــــەرم کردن لە جێگە و مەقامی زاناکانی ئەورووپا ، ڕوودان لە کام بەشی ڕستەکەدا هەیە ؟ .

---

(١٦) دەتوانم بڵێم بۆنی « فاعل ، کــارا »یێکیش بە زەروورەت دێتە زیهنەوە ، خۆ ئەگەر گوتبام « هاتم » فاعیلەکە وجودیشی لە فیعلەکەدا دیار دەکەوت ، بەلام وجودی فاعیل لە دەرەوەی فیعلەوە دێ و ڕەگەزی فیعلەکە نیە ، دەبینی هەرجارە فاعیلەکە دەگۆڕێ « هاتم ، هاتین ، هاتی ، هاتن .. » ، بەلام ڕوودان و کاتەکە هەر خۆیانن . بێگومان بەسترانەوەی فیعل بە فاعیلەوە لەو زمانانەدا کە ڕاناوی چالاکیان هەیە زیاتر دێتە بەر هەست تا ئەو زمانانەی ڕاناوی چالاکیان نیە . کە دەڵێی ( من نووسیم ) بەهۆی دەنگی « م » لەکۆتایی فیعلەکەدا کە بوە بە کەرتێکی چڕمساوی وشە ، شەخسی فاعیلت هێندی فیعلەکە لەبەرچاوە بەلام کە دەڵێی « I wrote » بەهۆی وشەی « I » نەبێ فاعیلەکە نایێتە بەر هەستی مرۆڤەوە ، واتە وشەی « Wrote » خۆی لە خۆیدا کەسی یەکەم بەدەستەوە نادا ، لە ڕاستیدا هیچ کەسێك بە دەستەوە نادا .. قسە درێژەی زیاتر هەیە بەلام دەرفەت نیە .

تۆ کە دەڵێی (دارا مەردە) حەقیقەتێکت باس کردوە ، چ مەبەستت ئەوە نیــە (تازە دارا بۆتە مـەرد) تا خەیاڵمان بۆ « ڕوٙدان » بچێ . لە ڕستەکەدا مەردایەتی دارا ڕوٙداوێکی تازە نیە کە پێشتر وجودی نەبوبێ . ئەگەر گوتبات (دارا مەرد بو) ئەوسا مەردایەتی دارا دەبو بە ڕوٙداوێك لە کاتی ڕابردوٙدا .

بۆ ڕوٙنکردنەوە فیعلێکی کەسی یەکەم دێنمەوە : دەڵێی (من مەردم) ئەم ڕستەیەش کە کردت بە (من مەرد بوم) ڕوداوێکی ڕابردوٙی لێ دەفامرێتەوە ، واتە کە وشــەی « مەرد »ت خــستە بەر تاوی فیعلێکی ڕاستەقینە ، واتاکەی کە « مەردایەتی »یە دەبێتە « ڕوٙداو » .

تەماشای ئەم نمونەیەش بکە : (دارا نوستوە ، من نوستوم) . لێتەوە دیارە بزوێنی « ە » کە من بە ڕاناوی دادەنێم و پیتی « م » کە بەلای زۆر لە زمانزانانەوە ڕانــاوە لەم تەرزە صیغەیەی فیعلــدا هەردوٙیان دەبنە هۆی بەرهەم هێنانی « ڕوٙدان » . واتە کە گوتبات (دارا نوستو ، من نوستو) ڕوٙدان پەیدا نەدەبو هـەرچەند لە ڕستەکەدا صیغەیێکی فیعلیش هەیە و ڕودانیش ڕەگەزێکی فیعلە .

کەواتە لە ڕستەی (مەرد بو) دا واتای « تجرید »ی مەردایەتی بە هۆی فیعلەکەی « بو » دەبێتە ڕوٙدان . هەروەهاش لە ڕستەی « نوستوم ، یا نوستوە »دا ڕاناوە چالاکەکان بە هۆی بونی صیغەیێکی فیعلی « نوستن »ەوە دەبنــە ڕاگەیێنی واتای « ڕوٙدان » ، هیچ

کامێك لە راناوەکان لە خودی خۆیاندا ڕوودانیان تێدا نیە .

لەم نمایشـــەدا دەردەکەوێ کە فیعلی « بوون »ت لە وشـــەی «مەرد » دوور خـــتەوەو راناوی « م »ت لە کۆتایی فیعلزا راگوێست بۆ دوای وشەیێك کە ڕوودانی تێدا نەبێ وەك وشەی « مەرد » ، ئیتر ئەو رستەی کە پەیدا دەبێ بەداهەتەن ڕوودانی تێدا نابێ ، واتە کە گوتت « مـــەردم » گوتەیێـکی بێ فیعل و بێ ڕوودانت گوتوە چونکە نە وشەی ( مەرد ) ، نە ( م ) هیچ کامێـکیان بە خەیاڵیش ڕووداویان تێدا بەدی ناکرێ .

بە راستی ئەوەی زیهن دەغەلەتێنێ و بەرەو هێندێـی دەبا وابزانێ لە رســـتەی « مەردم ، مەردە » دا ڕووداو هـــەبێ ، ئەو « حکم و اسناد » ەیە کە راناوە چـــالاکەکە رای‌دەگەیەنێ و بەوەدا بزووتنەوەیێـکی واتایی پەیدا دەبێ لە رستەکەدا کە هەرگیز لە وشەی سـارد و سڕ و بێ تاو و تین پەیدا نابێ ئەگەر هەزاریشی بە دوایەکدیدا قەتارکەی . کە بڵێی ( لێرەوە تا کەرکووك دەشت )و وەســـتای لە قســـەکەت ، چەند لاشـــەیێـکی وشە و ئەمرازت بە دوا یەکدیدا ریزکردوە بێ‌گیان و بزووتنەوە ، بەلام کە گوتت (.... تا کەرکووك دەشـــتە ) ئا ئەم بزوێنەی کۆتایی رســـتەکە گیانێك و جوجوڵێك دەخاتە بەر وشەکان و رەگەزێـکی تازە دێنێتە ناوەرۆکی رستەکەوە کە بریتییە لە بڕیاردانی ( دەشتایەتی ) مەودای میانی ئێرە و کەرکووك . فامرانەوەی ئەو بڕیارە لە رســـتەکەدا وا دەکا خەیاڵ بۆ

واتای ڕودان بڕوا ، کەچی هیچ شتێك لە نەبوبەوە پەیدا نەبوە ،
واتە ڕودان لە گوتەکەدا نیە ، لە ڕاگەیاندنی حەقیقەت بەولاوە . ئەو
بڕیار « حکم و اسناد »ە لە فیعلیشدا هەیە سەرەڕای ئەوە کە کات و
ڕودانیش هەیە ، واتە لە ڕستەی « نوسی »دا ڕودانی « نوسین »
لەکاتی « ڕابردو »دا دو ڕەگەزی ڕەسەنی فیعلەکەی « نوسین »ن ،
ئینجا بڕیارێکیش هەیە کە ڕوداوی « نوسین » لە کاتی ڕابردودا
قەوماوە . بەلام لە ڕستەی ( دارا مەردە )دا لە غەیری بڕیاری
هەبونی مەردایەتی کە هێز و پێزی گوتەکەیە ، نە ڕودان نە چ کاتێك
مەبەستی گوتەکەیە ، کە مەبەست نیە لێشی نافامرێتەوە .

ئەمە لەلایەن بون و نەبونی ڕودان لە ڕستەی ( دارا مەردە )دا .
با بزانین « کات » لەم ڕستەیەدا هەیە یاخود نیە ؟ .

بەر لەوە لە بارەی کاتەوە تۆژینەوە بکەم دەبێ ئەوە بڵێم نەبونی
« ڕودان » تەنها بۆ خۆی بەسە ببێتە ئیسپاتی نەبونی فیعل ، واتە
وشەیێك یاخود تەرکیبێك ڕودانی تێدا نەبو دیارە فیعلی تێدا نیە ،
چونکە ڕەگەزی هەرە گرنگ لە فیعلدا ( ڕودان )ە بە دوا ئەودا
کاتە ، سەرەڕای ئەوە کە بە کۆبونەوەی هەردو ڕەگەز فیعل پەیدا
دەبێ . سەیری چاوگ بکە دەبینی خۆی ڕودانێکی ڕوتە و هیچی تر ،
کەچی لەبەر نەبونی کات تێیدا ، پێی ناگوترێ فیعل هەرچەند
کاتیش دوەم ڕەگەزی فیعلە . بەو پێیە گریمان لە ڕستەی ( دارا
مەردە )دا کاتیش هەبێ ، فیعل هەر پەیدا نابێ چونکە ڕودان لە

رستەکەدا وجودی نیە ، لەگەڵ ئەمەشدا چ زەرەر ناکەین لە ساغ کردنەوەی بۆن و نەبونی کات لە رستەکەدا .

( دارا مەردە ، ئامێدێ شارێکی کوردە ، ئەهریمەن ئەفسانەیە ، زانکۆی سلێمانی چالاکترە لە هی بەسرە ، یا هی بەسرە چەلاکترە لە زانکۆی بەغدا ، دەستی راست لە هی چەپ بەهێزترە . . ) لەم رستانە و هەرچی وەك ئەوان هەیە ، بە خەیاڵی کەسدا تێ ناپەڕێ دارا کەی مەرد بوە ؟ شاری ئامێدێ ئیمڕۆ یا دوێنێ کورد بوە ؟ دەستی راست لە کەیەوە بەهێزتر بوە لە دەستی چەپ ؟ ، قسەکەر لەو گوتانەدا مەبەستی دەربڕینی راستییێکە[17] بێ ئەوە ئاگای لە دوێنێ و ئیمڕۆ و سبەینێ هەبێ و بێ ئەوە رستەکەش خۆی لەخۆیدا چ کاتێکی دەست نیشان کراو رابگەیەنێ . وا دەبێ لە دەرەوەی رستەوە ،

(١٧) عادەت وا رۆییوە بگوترێ « راستی » دەنا ئیمکان هەیە رستەکە درۆی تێدا بێ یاخود کابرای قسەکەر مەبەستی درۆ بێ . زانەن رستەی « خبری » ئەو رستەیەیە کە هەڵدەگرێ راست بێ یا درۆ بێ وەك ئەوەی بڵێی « داری گوێز لە قەزوان بە عومرترە ، دارا ئامۆزامە » . واش دەبێ رستەی « خبری » هەر درۆی رونە وەك : شاخی هەورامان لە فەرەنسەیە . لە رستەی « خبری » دا بڕیار هەیە کە پێی دەڵێن « حکم و إسناد » ئیتر بڕیارەکە راستی و درۆیی هەڵدەگرێ . فەرقێکیش نیە لەوەدا رستەی « خبری » فیعلی تێدابێ یا نەبێ : باران باری ، سبەی دەچمە پردێ ، دارەکەم ئاو دا .. هەموویان رستەی « خبری » ن . رستەی « انشائی » درۆ و راستی هەڵناگرێ وەك کە بڵێی : کاشکی نەچوبام ، خوابە لێم خۆش بی ، هەستە لەوێ لاکەوە .

ڕێکەوت یاخود حاڵ ، کات بە ڕستەکەوە دەلکێنێ وەك : دارا لێرەیە ، من تێرم ، جلەکانم لای وتۆچین ، هەمۆ لەشم تەڕە . لەم ڕستانەدا دیار دەکرێ ڕاستییەکان لە کاتی ئێستادا هەن ، بەڵام ئەم دیارکردنە ڕاگەیاندنی حاڵە نەك تەرکیبی ڕستە . تۆ سەیرکە حاڵ و ڕێکەوت چ کارێك دەکەن لە ڕستەی وەك (منداڵەکە نە دەچێتە مەکتەب و نە دەبێتە شاگردیش لای دارتاش) . لەم ڕستەیەدا هەر دۆ فیعلی (دەچێ و دەبێ) فیعلی «مضارع»ن ، کەچی نەچۆن و نەبۆنە کە لێرە بەپێشەوە مەعلۆم کراوە و ڕوداوی تێپەڕیون .

کە دەڵێی (هەنگوین شیرینە) ڕاستییێکت گوتوە لە هەمۆ کاتدا هەر ڕاستە ، واتە لە وەتەی هەنگوین هەبوە هەر شیرین بوە ، ئێستاکەش شیرینە و لە دوارۆژیشدا هەر شیرین دەبێ ، خۆ کەسیش ناڵێ لەم ڕستەیەدا سێ کات بەجارێ کۆبۆتەوە .

کە دەگوترێ کات لە وشە وەیا ڕستەدا هەیە مەبەست ئەوەیە لە خودی وشەکە یا تەرکیبەکە کات هەبێ نەك لە دەرەوە زەرۆرەت ، یا ڕاگەیاندنی حاڵ ، یا پێویستیێکی عەقلی و مەنتیقی هێنابێتی . ئەگەر تەماشای تەنها واتا و ناوەرۆکی وشە و تەرکیبی ڕستە نەکەین و گوێ ڕاگرین بۆ دەنگ و صەدای دەرەکی داخوا کاتمان بۆ تێ دەخوێنێتەوە یا ناخوێنێتەوە ، هەمۆ فیعلەکان تێکەڵ بە یەکدی دەبن و شیرازەی باسی زانستی زمانی لەبەر یەکدی

هەڵ دەوەشێ ؟، حاجی قادر دەفەرموێ :

( هەرکەسێ زا بە ناعەلاجی مرد )

دوَ فیعلی ( زا ، مرد ) هەردوَیان رابردوَن ، کەواتە ئەم قسەیە هەقی بەسەر ئەو کەسانەوە نیە لێرە بە دواوە دەبن ، ئەو کەسانەش ناگرێتەوە کە وا جارێ نەمردوَن چونکە نەیگوت ( بە ناعەلاجی دەمرێ ) .

دەڵێی ( تێ نەکۆشیت ، سەر ناکەویت ) . فیعلەکان بۆ کەسی دوەمی تاکن و « مضارع »یشن ، کەواتە کەسێکی تر بەر ئەم قسەیە ناکەوێ ، ئەو کەسەی پێشتریش تێ نەکۆشابێت لەوانە بوە دەرچوبێت .

خولاسە دەلالەتی حاڵ نابێ دەخلی هەبێ بەسەر سروشت و واتای وشە و رستەوە . رێزمان خەریکی خودی وشە و دارشتن و تێکهەڵکێشانی ئاخاوتن دەبێ . کە فیعل روالەتی رابردوَ بێ هەر بە رابردوَ دەمێنێتەوە با دەلالەتیشی بۆ دوارۆژ بێ یا بە پێچەوانە .

لە رستەی وەك ( دارا مەردە ، ترێ میوەیە )دا کە وا مەبەست دەرخستنی باوەرێك وە یا راستییێکی «مطلق »ە و هیچ یەك لە بەشەکان و کەرتەکانی رستەکان لە خۆیانەوە پەنجە بۆ کاتێکی دیار کراو درێژ ناکەن، هەر « اعتبار »ێکی دەرەکی بێ و کات « تحدید » کا بۆ ئەم باوەرە وەیا راستییە ، بایەخی پێ نادرێ لە گۆشەی نیگای رێزمان و زانستی

زمانەوە . کە لە عەینی رستەکەدا کات پەیدا نەبوّ ئیتر ئەواکات نیە .

لە عەرەبیدا دەمەتەقە نیە لەسەر هەبوّنی رستەی بیّ فیعل ، ئەو بڕیار و « حکم و اسناد » ەکە لە کوردیدا بەهۆی راناوی چالاکەوە پەیدا دەبیّ ، لەوێدا تەرکیبی رستە ، بەتایبەتی « تنوین الضمة » ، دەیخاتە ناوەڕۆکی گوتەکە : دەڵێی « دارا رجلٌ ، العنب فاکهةٌ » بەوەدا هەموّ واتای ( دارا مەردە ، ترێ میوەیە ) بە خۆیان و راناوی چالاکیانەوە هاتنە ناوەوە چ شەڕە دەندوکێش نیە لەسەر بوّنی فیعل . بەڵیّ دەزانم نەبوّنی فیعل لە هەندیّ رستەی عەرەبیدا راستەوخۆ ئیسپاتی شتێك ناکا لە زمانی کوردیدا بەڵام هەر نەبیّ بە بیرماندا دێنیّ زمان هەیە رستەی بیّ فیعلی تێدایە ، واتە نەبوّنی فیعل لە رستەدا کارێکی « مستحیل » نیە ، چ سەیر بیّ هاتنیشی ناوێ «حکم و اسناد» لە زمانێکدا بە « تنوین » و لە یەکێکی تردا بە راناوی چالاك پێك بیّ ، بیّ فیعل و بیّ کات .

ئێستا کە شریتەی وتوویژ و موناقەشە ، دوای ئەم گەشتە دوّر و درێژە ، زۆر بە ئاسایی دەمانگەیەنێتە دوا ئاڵقەی زنجیرەی باسەکە : ئایا کە ئەم بزوێنەی کۆتایی رستەی وەك ( دارا مەردە ) واتە بزوێنی ( ە ) کە فەتحەی عەرەبییە ، خۆی هۆی پێکهێنانی حوکم و ئیسنادە لە رستەکەدا دەبیّ چ ناوێکی لیّبنریّ ؟ ئایا فیعلە یاخود راناوە یاخود شتێکی ترە ؟ .

بەنیسبەت پرسیاری ئەوە کە فیعل بیّ لێرە بەپێشەوە بە درێژایی

تۆسینەکەم گوتومە فیعلی تێدا نیە چونکە رووَدان و کاتی تێدا نیە .
ئێستاکەش دوَبارە دەکەمەوە ئەم بزوێنە هەرچی ببێ فیعـل نابێ .
کەسێك بشیەوێ ئیسپاتی فیعل بوَنی ئەم بزوێنە بکا دەبێ بەشێکی
زۆر لە رێزمانی کوردیَ بگۆرێ تاکوَ دوَچـــاری « تناقض » نەبێ
لەگەڵ خۆیدا . من لێرە بەپێشـەوە گوتم فیعـل دوَ رەگەزی بنجی
هەیە (رووَدان و کات) و بـــزر بوَنی یەکێك لەم دوَ رەگـەزە لە
وشەدا پەکی هێندیێ دەخا پێی بگوترێ فیعل ، ئێستا ئەمەش ئیزافەی
سەر ئەو قسانە دەکەم کە لەو تەعریفانەی بـۆ « فعل » دانـراوە لە
کوردیَ ، سەرەڕای کات و رووَدان مەرجێکی تریش دانـــراوە بـۆ
حیساب کردنی وشە بە فیعل : دەبێ وشەکە خۆی لە خۆیدا واتایێکی
تەواوی هەبێ نەك بە هۆی وشەی تر یا یارمەتی رستە و تەرکیبی ناو
ئاخاوتن ، واتە دەبێ فیعل لە تەنیا وشەکەی خۆیدا کات و رووَدانی
تێدابێ وەك : هات ، دەخـــوا ، ببینە .. لیژنەی رێزمانی کوردیَ
سەر بە کۆڕی زانیاری کوردەوە خۆیشی ئەم « تعریف »ەی پەسند
کردوە بۆ فیعل . دەوجا کە ئەم تەعریفە بکەین بە چــرا و فیعلی
پێبناسینەوە چ لزوم نامێنێ بەنیسبەت راناوی جالاکەوە بـــە دوا
کات و رووَدانیش دا بگەڕێین چونکە ئاشکرایە هیچ کامێکیان بـە
تەنهایی واتا بە دەستەوەنادا نە بێ زەمان و نە بە زەمان و نە بێ
رووَدان و نە وەکی تر .. خـــۆ ئەوەی راستی بێ لەبەر تیشکی ئـەم
تەعریفەدا هێشتا دەنگی « مبهم »ی وەك (هەچـە ، ختـە ، چغە ،

وەشە ، هەیەە ، کشە .. ) کە بۆ «امر و نهی» بەسەر ئاژەلدا بەکاردێ زیاتر بەر واتای فیعل دەکەوێ تا راناوی چالاك چونکە ئەم دەنگە موبهەمانە بەقەدەر « فعل أمر » کات و ڕوودانیان تێدایە ، خۆ دیارە وشەی ئەوتۆ دەشنوسرێن . کە گوتت ( ختـە ) وەك ئەوەیە گوتبێتت ( ئەی پشیلە لاچۆ ، دوور کەوە ) . نیسبەتی پەیوەندی کات بە فیعلی ئەمرەوە لە چاو فیعلی رابردوو و « مضارع »دا داستانێکی سەربەخۆیە ، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی تایبەتی هەیە کە بە هیچ شکڵێك لێرەدا جێی نابێتەوە ، ئەوەندە تێبینییەشم هێنایە بەرچاو تاکوو خوێنەر یا زمانزان وەك شوانی پەپۆز کە وا بە ترۆکەیێکی[18] شەوقی هەورە تریشقە رانەکە بەسەر دەکاتەوە ، ئەویش لە ترۆسکەی ئەم تێبینییەوە لایەنێکی مەیلەو تاریکی زمان بێنێتە ناو جغزی نیگایەوە و زیهنیشی بە دوا لایەنی تاریکی تردا بگێڕێ .

لام وایە چیتر لزوم نیە بە دوا ئیسپاتی فیعل نەبوونی بزوێنی کۆتایی رستەی ( دارا مەردە ) دا بکەوین ، چونکە ئەوەندەی هێنامانە بەر چاو لە ڕوونا کی و بەلگە و هۆی شت ناسینەوە ، ئەم بزوێنەی رووت کردەوە لە هەموو واتا و سروشت و تایبەتی و ڕواڵەتی فیعل .

بەڵێ بێگومان ( دارا مەردە ) رستەیێکی بێفیعلە ، وەك ( مبتدأ و خبر )ی زمانی عەرەبی حوکم و ئیسنادی تێدایە بەلام نەك

---

(١٨) ترۆکە : بە واتای « لحظە » دێ هەردوو وشەی « ترووکاندن ، لحظ » لە چاوەوە سەر هەڵدەدەن .

لە ڕێی داڕشتنێکی ڕوَتەوە کە « تنوین » تێیدا دەبێتە تەواوکەری واتا ، بەڵکو بەهۆی بزوێنێکی ئاشکراوە کە وا بتوێێکی هەمیشەیی هەیە لە ڕستەدا و ناشێ بە هیچ جۆرێك بن لێو بخرێ وەك « تنوین » . لە هەر حاڵێك و هەر زەرفێکدا بزوێنەکەت لادا و گوتت ( دارا مەرد ) ڕستەکە واتا دەدۆڕێنێ ، لە ڕستەیی دەکەوێ . بەڵێ دەتوانی جێگەی بزوێنەکە بگۆڕی و بڵێی ( دارایە مەرد ) کە ئەوسا بەولای ( حکم و اسناد )ەوە واتایێکی زیادیشت دەربڕیوە وەك « مبالغە » یاخود مەدح بێ .

دەمێنێتەوە بزانین کە ئەم بزوێنە فیعل نەبێ دەبێ چی بێ ؟

بەرلەوە لە پرسیاری ( چیە ) بتۆژینەوە با سەرێکی جێگەی بزوێنەکە بکەین لە ڕستەدا :

من مەردم .

تۆ مەردی .

ئەوان مەردن .

ئێمە مەردین .

ئەو مەردە ، خۆی مەردە ، دارا مەردە .

چ گومانێك نیە لەوەدا بزوێنەکە جێێ ڕاناوی چالاکی پڕاوپڕ گرتۆتەوە و وەك ئاوەڵەکانی هۆی ( حکم و اسناد )ە لە ڕستەدا . بەڵام کە ئەمە وا بێ ، لە سەدی سەد وایشە ، ئاخۆ ڕاناوە ؟ .

لێرە بەپێشەوە باسی ئەوەمان کرد لە کوردیدا بۆ پێك هێنانی رستەی بێ‌فیعل راناوی رابردوی تێنەپەڕ بەکار دێ ، واتە هەر وەك دەڵێی (ئێمە رۆیشتین) دەشڵێی (ئێمە مەردین) . چاکتر ئەوەتە لیستەیێك رێك‌خەین بۆ رون کردنەوەی ئەو بەدیهیە ، دەڵێی :

من رۆیشتم		من مەردم .

تۆ رۆیشتیت		تۆ مەردیت یاخود رۆیشتی ، مەردی .

ئێمە رۆیشتین		ئێمە مەردین .

ئێوە رۆیشتن		ئێوە مەردن .

ئەوان رۆیشتن		ئەوان مەردن .

کە بێینە عاست کەسی سێیەمی تاك دەڵێین :

ئەو رۆیشت .

لەم فیعلەدا ، وەك پێشتر گوتمان ، راناوی چالاك نیە ، کەواتە بۆ پێك‌هێنـانی رســـتەی وەك (تۆ مەردی ، من مەردم) ناتوانین راناوی چالاك بخوازینەوە لە فیعلی رابردوی تێنەپەڕی کەسی سێیەمی تاك ، چونـکە راناوی چـــالاکی نیە . بەم جۆرە کە بێین و چاوەنۆڕی راناوێـکی نامەوجود بکەین یەکی وتوویێژمان دەکـــەوێ لە هەمو ئەو رستە بێ‌فیعلانە کە خاوەنەکەیان کەسی سێیەمی تاك بێ چونکە دەزانین لە کوردیدا رســـتەی بێ فیعل واتا نابەخشێ بێ راناوی چالاك .

لەم سەرنج گرتنەدا دەردەکەوێ ئەم بزوێنــەی کۆتایی (دارا مەردە) و هەمتوو رستەییێکی وەك ئەو ، ناچاری هێناوەتی و جێی راناوی چالاکی کەسی سێیەمی تاکی پێ گرتۆتەوە بۆ دروست کردنی رستەی واتادار ، کە ئەمە نەکرابا یا دەبتوو رستەی بێ واتا بەکاربێ وەك (دارا مەرد ، زستان سارد ، براکەت زیرەك) یاخود ئەو رستانە سەر لەبەریان یاساغ بکرێن کە ئەمە شتێك نیە خەیاڵ بۆی بچێ .

رەنگە کەسێك بڵێ خۆ لە فیعلی رابردوی تێنەپەڕیش راناوی چالاك نەبتوو بۆ کەسی سێیەمی تاك کەچی بە سەلیقە دەزانین فیعلەکە واتای تەواوی هەیە «بە حکم و اسناد»ەوە : کە دەگوترێ (هات ، رۆیی ، نوست ، بڕا ، سوتا ، فڕی ..) بەقەدەر (هاتم ، رۆیشتین ، نوستین ، بڕاین . . .) لەبەر زەوق و زیهنمان راست و دروستە و هیچ ناتەواوییێکیان لێ هەست ناکەین ، کەواتە رەنگە بتوو ئەگەر لە رستەی بێ فیعلیشدا راناوی کەسی سێیەمی تاك نەبا پێی راهاتباین و لێمان بە نوقســـانی نەگرتبا . بەڵێ رەنگە شتی وەها بگوترێ ، خۆ ئەگەر کەسیش نەیڵێ وا من گوتم . بەڵام قسەکە جێی قەناعەت نیە ، کە باشی لێ ورد بیەوە :

جارێ هەر لەپێشەوە خاوەنی زمانەکە وەرامی داوتەوە بەوەدا کە رازی نەبوە رستەی بێ فیعل بێ راناوی چالاك بێ ، راهاتـن و رانەهاتنیش لە زووەوە دەرگەی باس لێ کردنی بەستراوە چونکە زەوقی کوردی خۆی لە عاســـت دوو « احتمال »ی بوون و نەبوونی

راناوی چالاك نەدیوە تا كو رێ هەبێ خەیاڵمان بڕوا بۆ « احتمال »ی پێ راهاتن . تا كە « احتمال » هەر ئەوە بوە كە دەبێ راناوی چالاك لە رستەی بێ فیعلدا ببێ ، ئەگەر نەبێ پێویستە بۆی خەلق بكرێ .

بەنیسبەت نەبونی راناوی چالاك لە بەشی هەرە زۆری فیعلەكان بۆ كەسی سێیەمی تاك و لە فیعلی « أمر » بۆ كەسی دوەمی تاك ، تەعلیلێكی رێك و پێك هەیە كە راستەوخۆ لە « فقه »ی زمانەوە هەڵدەقوڵێ ، بەلام زۆر بەداخەوە ، وەك زۆرتر عوزرم هێنایەوە ، چ دەرفەت و مەودای شی كردنەوەی ئەم جۆرە لاباسانە لە گوتارەكەدا نەماوە ، بۆیێ بە ناچاری لەبیر خۆمی دەبەمەوە و دەگەڕێمەوە بۆ ئەسلە باسەكە و وەرای دوا پرسیاری سەر بەو بزوێنەی كۆتایی رستەی (دارا مەردە) دەدەمەوە و خەریك دەبم بزانم ئەم بزوێنە لە كوێوە هاتوە .

هەرچەند لێم رون نیە لە كەیەوە كورد وێنە ئاخاوتنی ئێستاكەی بەكار دێنێ و لەبەر ئەمە ناتوانم سەرچاوەی مێژوویی بۆ كەرستەیێكی تەعبیری وەك ئەم بزوێنە دەست نیشان كەم و بیخەمە پەراوێزی زەمەنی خۆیەوە ، دیسانەوە تێكڕای زمانەكە ، وەك میراتێكی مێژوویی ، تایبەتیەكانی رەسەنی كۆنینەی خۆی پاراستوە تا ئەو رادەیە كە شارەزاییەكی گشتی و ورد بە تەركیبی ناوەكی زمانەكە و میكانیزمی هاتنە گەڕی دەستورەكانی دەسەلات

دەدەن بە تۆزەرەوە تەعلیلی گەلێك لەو زاهیرە و رواڵەتانەی بکا کە بنجی مێژوویی‌یان نادیارە . لە فەرزی پێکانی نیشانەش زەحمەت بێ لەو زیهن کاریانەدا ، گوتانەوەی رێبازەکانی زمان ئاشنامان دەکا بە تێك کردنەوە و لە یەکدی ترازان و راستایی و پێچە بە دەوردیان ، ئیتر وەك بەڵەد بتوانین دەوری نیشان هەڵبێین ، کە نەشی پێکین .

زانیمان ناچاری ئەم بزوێنەی هێناوە تاکو جێی راناوی چالاك پڕ کاتەوە لە رستەی بێ فیعلدا . ئێستا پرسیار لەوە دەکرێ بۆچی ئەم ناچارییە شتێکی تری نەهێنا ؟ چ دەقەوما بگوترابا (دارا مەردك ، یاخود مەردش ، یاخود مەردوف) یا هەر شتێکی تر بێ ؟ بێ گومان چ نە دەقەوما ، بەڵام ئەوساش پرسیارەکە هەر بە ملەوە دەما و دەگوترا بۆچی ئەم پیتە ، یاکۆمەڵە پیتە هات زیادە لە هەموو شتێکی تر ؟

من ئەوەندەی تێدەفکرم لەوە کە ئەمرازێك یاخود هۆیێکی تەعبیری رێك و پێکتر و ئاسانتر و سووکتر لەم بزوێنەیە بدۆزمەوە و بڵێم دەبوا سەلیقەی کورد ئەوی هێنابا و کەلێنی ناچاری پێ پڕکردبایەوە ، ناگەم بە هیچ ئەنجامێك ، ئەو ئەنجامە نەبێ کە زمانی کوردی لەخۆوە و بێ مامۆستا ئەم بزوێنەی هێناوە کە کەمترین میقداری ئاخاوتنە و لەو کورتتر چ دەنگ پەیدا نابێ ، و کردوەتی بە مزە و باجی ناچاری !! جەردەیە و رێی پێ گرتووم

دەیەوێ شتێکم لێ بسەنێ ، منیش بە تاکە یەك « فلس » لە کۆڵ خۆم کردەوە و رێگەم پێ چۆڵ کرد . بە جگەرە رازیم کردبا لە فلسێکی پتر دەگرتەوە .

کەواتە بیر و باوەڕی من ئەوەیە کورد بە ئەسل لەبەر ناچاریی ئەم بزوێنــەی هێنا و لەمەشـــدا کەمترین ئەرکی بە خەرج بردوە چونکە لەوە کەمتر و سوکتر چنگ ناکەوێ .

بێگومان لە کوردیدا ( ئاسانی تەعبیر ) یەکێکە لە تایبەتیەکان و مەبەستەکانی ئاخافتن . لە گوتاری ( بەکارهێنـــانی « ی » لە رێزمانی کوردیدا ) کە لە بەرگی یەکەم — بەشی یەکەمی گۆڤاری کۆڕدا بلاوکرایەوە هەوڵم داوە ئەم لایەنەی زمانەکەمان نەختێك رون کەمەوە لە رێی رون کردنەوەی سروشتی نەرم و شلی دەنگی ( ی ) وە کە بە زۆری لە پێکهێنانی رستە و واتادا بەکار دێ . ئەم بزوێنەی ( ە ) ش هەمان سروشتی بایەخداری هەیە بەلام لە روی زێدە کورتییەوە . ئەوەی راستی بێ بزوێنی « ە » هێندە کورت و « مختصر » ە بە بەریەوە نیە نەرم و شل بێ . بەلام لەگەڵ ئەم هەموو کورتییەشـــدا هەرگیز ناشێ تێبچێ ، کە وەك راناو بەکارهاتبێ ، چونکی نەمانی راناوەکە واتای رستەکە لەناو دەبا . لەبەر ئەم هۆیە گرنگەیە کاتێك کە بکەوێتە دوای وشەیێك کوتاییەکەی بزوێن بێ ( یێی ) پەیوەندی دێ و دەبێتە ئێستگە تا بزوێنەکە خۆی بەسەرەوە گرێ . دەڵێی ( ئەمە چرایە ، لەسەر چاوت برۆیە ، ناوت چییە ،

پاردم پێیە ، منداڵ حەزی لە گەمەیە ) . کە کۆتایی وشە (واوی تیژ) بێ وا دەبێ بزوێنەکە دەخەنە سەر واو ، واشدەبێ (یێ)ی پەیوەندی[19] بۆ دێننەوە . دەگوترێ (جارێ زووە ، جارێ زۆیە ) .

ئەم راستییە ، بەرەو دواوە ، تیشکێك داوێ بۆ سەر یەکێك لەو مەوزوعانەی پێشتر لێی دواین .

ئەو لەهجە کوردییەی کە دەڵێ (دارا مەردەس ) چ یێی پەیوەندی ناهێنێ بۆ پاراستنی بزوێنەکە ، بە پێچەوانە بزوێنەکە تێدەبا و هەر سینەکە دەهێڵێتەوە و دەڵێ ( چراس ، برۆس . . ) . کە سرنج بگرین دەبینین فارسیش هەر وا دەکا ، واتە دەڵێ (بالاست ، نیکوست . . ) . لەمەڕا دەردەکەوێ ئەم لەهجە کوردییە بەهۆی نزیکی و دراوسێیەتی لەگەڵ فارسدا سینەکەی هێناوەتە ناو ئاخاوتن و هەندێك لە راستەی شەقامی کوردی دوورکەوتۆتەوە ، بزوێنەکەی (دارا مەردە)ش پاشماوەی (است)ی فارسی نیە و بەچکەیێکی زادەی کۆشی زمانی کوردییە .

ئەم بزوێنەی «ە» بەهۆی سۆکی و کورتییەوە بۆ مەبەستی تریش بەکار دێ لە ئاخافتندا ، بەڵام دیارە لەو حاڵانەدا «حکم و اسناد» پێك ناهێنێ ، وەك ئەوەی لەگەڵ ئیشارە و ئەمرازی «تعریف» دا خۆ بە وشەوە دەلکێنێ ، دەڵێی (پیاوەکە ، ئەم

(١٩) وشەی (پەیوەندی) بۆ ئیزە دەست نادا بەلام ماوەم نیە بەدوا وشەیێکی تردا بگەڕێم .

پیاوه ، ئەو پیاوانه ، پیاوەکان ..) . وا دەبێ کە بە دوا بزوێندا هات یێیەك دێ و دەپارێزێ واش دەبێ تێ دەچێ ، دەڵێی : (ئەم برایە ، ئەم پەنجەرەیە) کە لێردا پارێزرا ، بەڵام لە رستەی وەك (پەنجەرەکە داخە ، براکەت رۆیشت) تێچوو . شێوەی تریش هەیە بۆ تێبردن و پاراستنی بزوێنەکە لە لەهجەی تری زمانی کوردیدا وەك کە لە ناوچەی کۆیێ و زۆر شوێنی تری کوردستاندا دەڵێن (برایەکەم هات ، ئەو پەنجەرە داخە) .

وا دەبێ بۆ داڕشتنی وشەی تازەش بزوێنەکەی « ە » بەکاردێ ، دەڵێی (چاك ، چاکە ـ خراپ ، خراپە ـ دەست ، دەستە ـ لێکەوتە — کردە و بردە ..) . کە خەریك بێ گەلێ جۆری تری بەکارهێنانی ئەم بزوێنە دەدۆزیتەوە لە زمانی کوردیدا ، کە ئێرە جێی هێندێ نیە .

کەواتە پوختەی باوەڕی من دەربارەی بزوێنی رستەی وەك (دارا مەردە ، رێگاکە سەرەو لێژە ..) ئەوەیە کە ناچاری هێناوەتی بۆ دروستکردنی « حکم و اسناد » لە رستەی بێفیعلدا ، لەم کارەشدا بە ئەرکی (راناوی چالاك) هەڵدەستێ ، کەواتە :

ئەم بزوێنە جێی راناوی چالاکی گرتۆتەوە .

ئەم بزوێنە بۆتە راناو .

ئەم بزوێنە راناوە[20] .

* * * * * *

## (( ڕوون کردنەوە ))

لەم گوتارەمدا نیشانەی سەر « ی »ی درێژی قوچاوم هـەر بۆ ئەو « ی »ە بەکار هێناوە کە نەلـکاوە بـە پێش خـۆیەوە وەك وشەی (کوردیێ ، بلاویێ ..) . قاڵبی ئەم « ی »ە لە شکڵی لـکاوی بە پیتیترەوە ، نیشانەکەی « ـ » وەك دوو خاڵی پیتی « ت » خـۆ دەنوێنێ ، بە داخەوە ئەمە هەڵەی ئەو ساختمانەیە کە پیتەکانی داڕشتوە بۆ چاپی کۆڕی زانیاری کورد ، وا کۆڕ خەریکە پیتیتر دادەڕێژێ کە خۆش خوێن بێ .

دیسان دەسپارێزیم نەکردوە لە بەکارهێنانی وشەی بێگانە بـۆ مەبەسی تێگەیاندن . زاراوەکانی « ماضی ، مضارع ، أمر ، حکم ، اسناد ، مطلق ، فعل ، فاعل ، مفعول ، مصدر ، ظرف ، صفه ،

---

(٢٠) تکایە لە سەرەتای دێڕی دوازدەم ، لاپەڕە ( ٨٠ ) ی ئـەم کـتێبە ( خاوەن دیان ) راست کەوە و بیکە بە ( خاوەن کیان ) بە واتای ( تەوارە ) ، وەك کە بڵێی ( تەوارەی سیاسی ـ کیانی سیاسی ) . بە داخەوە ئەم هەڵەیە واتای رستەکەی بە جاریێ گۆڕیوە ، پێویـستم زانی خێرایی بکەم لە ڕاکێشانی سرنجی خوێنەر بۆ راستی وشەکە .

موصوف .. » و گەلێکی‌تری وەك ئەمانە هەمۆ کەس تێیانـ دەگا ، لەوانەبۆ کە وەرمگێڕابانە سەر کوردی ، بە هۆی ئەوەوە کە وا جارێ خەلق پێیان رانەهاتوە ، واتا و مەبەســـی نۆسینەکە بەلای گەلـێ کەسەوە وەزەحمەتتر کەوتبا .

خۆم ئازاد زانیوە لە پەیڕەوی کردنی جۆری رێنۆس ، چونکە تا ئێستاش بڕیارێك دەرنەچوە بۆ دەســـت نیشـان کردنی یەکێك لەو جۆرانەی لە باودان . تا ئەو رۆژەی بڕیارێك شوێن خشکەی خامە رۆن دەکا و بەسەردا رۆیشتنی بۆ دەکا بە دەســـتور ، من و تۆ و هەمۆ کەسێك دەتوانێ یەکێك لە رێنۆسە ئاشناکان بکا بە گەشتگەی خامەی .

ئاغلەب باسەکان کە لێیان دواوم گەلێك زیاتر لێکولینەوە و تۆژینەوە و درێژە پێدان هەڵدەگرن ، هەندێك باسیش هـەن هـەر بەجارێ لێیـان خامۆش بـــۆم . ئەوەی راستی بێ ، لەبەر تازەیـی تۆژینەوەی « فیـلۆلۆجی » لە کوردیدا ، بەتایبـەتی لەبـــەر کاری وێرانکەری لاسایی کردنەوەی بێگانە لەو هێندە تۆژینەوە کەمـــەی کە تا ئێستا خراوەتە کۆڕی رۆشـنبیری کوردییەوە ، زوربەی سەرە باسەکانی زمان ، هەریەکەیان هەڵدەگرێ کتێبی دۆر و درێـــژ و بەهـــێز و پێزی لەسەر بنوســـرێ . باسی « ضمیر ، راناو » بە کتێبێك تەواو نابێ کە بمانەوێ لە هەمۆ بارێکیەوە لێی بدوێین ، دەشێ لە هەڵـکەوتی دوارۆژدا بۆ خۆم خەریکی تەواو کردنی بەشێك

لەو باسەنە بم کە بە ناتەواوی لەم گوتاردا لە سەرم نوسیون .

گۆشەگیریم کرد لە ناوهێنانی ئەو نوســەرانە کە رەخنەم لە رایەکانیان گرتوە ، تا کە ناوێك نەبـێ کە تێزادیتەیی برایەتی و ئاشنایی میانمان زاڵی کردم بەسەر دوودڵی کردن لە دەربڕینی ، خـۆ ئەگەر هاتبام یەك یەك ناوی نوسەرەکانم هێنابا و رایەکانم بە درێژی هەڵسەنگاندبان ، ئیتر هەر نەدەگەیشتم بە کۆتایی گوتارەکە ، کە وا لەگەڵ هەمتو مەودا لێ کورت کردنەوەشی هێندە خۆی لێك کێشایەوە کە مەجبورم بکا تکای بەخشین بکەم لە خوێنەرانی بەڕێـــز .

* * * * * *

